پڕۆژەی تیشک

٥




# صەلاحەددینی ئەییوبی

## گەورەتر لە ڕەخنەگرانی

گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن



ئامادەکردنی:

**ئاراز عەلی سەعید**




# صەلاحەددینی ئەییوبی

## گەورەتر لە ڕەخنەگرانی

### گفتوگۆ لەگەڵ پڕۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن

ئامادەکردنی :

ئارام عەلی سەعید

چاپی یەکەم

٢٠٠٦ی زاینیی ١٤٢٧ی کۆچی

**ناوی کتێب:** صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی. گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن.

**ئامادەکردنی :** ئارام عەلی سەعید .

**ژمارەی سپاردن :** (٧٦٣)ی ساڵی ٢٠٠٦ .

**تیراژ:** ٢٠٠٠ دانە.

**شوێنی چاپ :** چاپخانەی چوارچرا.

**نۆرەی چاپ:** یەکەم.

**ساڵی چاپ:** ٢٠٠٦.

**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (٥).

**ئیمەیلی پرۆژە :** tishkbooks@yahoo.com




**ئەم بەرهەمە پێشکەشە بە:**

- هەموو ئەوانەی صەلاحەددین ئاسا قوڵی مەردانەیان هەڵماڵیوەو خەمی ئاینو نەتەوەکەیان لە پێشەنگی کاریاندایە .
- کوڕەکەم (میرباد)، هاتنی ئەو ئاهێکی بەهاری بوو بۆ بەری پایزی ژینمو وشەکانی ئەم پەڕتووکە لەگەڵ ئەودا لەدایك بوون.

## بە ناوی خوای گەورەو میهرەبان

### پێش باس

ئەم کتێبە ئەگەرچی پێکهاتووە لە گفتوگۆیەکی چەند سەعاتی لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن–داو لە کاسێتەوە گوازراوەتەوە بۆ سەر کاغەز، بەڵام بە هێندەی نووسینی نیمچە لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لەگەڵیدا ماندووییم کێشاوە، دارشتنەوەو نووسینەوەو دانانی ڕستەو گوزارشتەکان لە جێگای خۆیانداو وردەکاریی و کاتێکی زۆریان تێدا بەخەرجدراوە.

نووسینەوەی یەك بەیەك پەراوێزو دۆزینەوەی ناوی سەرچاوەکانو کنەو گەڕان لە نێو کتێبخانەکاندا بۆ دەستخستنیان هەموویانم لە ئەستۆگرت، دکتۆر بە حوکمی ئەوەی ساڵانێکی دوورودرێژە لە بەغداو وڵاتە عەرەبییەکان ژیاوەو دیراسەو وانەو وتنەوەو نووسینەکانی بە زمانی عەرەبی بوون، دەربڕینی بێژە (لفظ)ەکانی کە بە کوردی دەدوێت زیاتر لە تێکەڵەیەکی عەرەبی پێکهاتووەو تێکرای ڕستەو گێڕانەوەکانی جارێکی دی بۆ زمانی نووسین گۆڕانکاری تێدا کردووە.

کەواتە هەر هەوڵێك لەمجۆرە با لە شێوازی گفتوگۆو پرسیارو وەڵامیشدا بێت، بەڵام کۆکردنەوەو لەچاپدانی لە کتێبێکدا لە ڕووی شێوازی دارشتنو نووسینەوەی ئەکادیمی بوونەوە ڕێڕەوو سەلیقەی تایبەتی دەوێتو پێویستیی بە گرتنەبەری شێوازێکی ڕێکو پێك هەیە.

بەهەرحاڵ ئامانجو مەبەستی من لەم نووسینە لە ڕێگای ئەو پرسیارانەوە کە ئاراستەی دکتۆرم کردووە، هاتۆتە دی، ئەو هاتنەدییەی کە ماوەی چەندین ساڵە لە لایەن هەندێ لە ڕۆڵەکانی کوردەوە بە ناحەق سەرکردە صەلاحەددین بە چەندین قسەو قسەلۆکی نەشیاوو بێئاگا لە مێژووی سەردەمەکەی بە ناحەق تۆمەتباری دەکەن، دەرەنجامی ئەوەیە کە چوار ساڵی خوێندنم لە (زانکۆی سلێمانی، بەشی مێژوو) لە نێو تۆمەتو بوهتانو ناشیرینکردنی سەرکردەی مسوڵمانی کورد صەلاحەددینی ئەیوبی تەواوکرد، دەیان کۆڕو سیمینارو موحازەرەی بێ جێ لە مەڕ ئەم بابەتە دەخرایە ڕوو، هەموو ئەو بۆچوونە سەقەتو نابەجێیانەو دەردی نەخوێندەواری هەندێك لە مامۆستاو قوتابیانی زانکۆ لە (بەشی مێژوو)دا یەکێك لە هاندەرەکانم بوو بۆ سازدانی ئەم دیدارو گفتوگۆیە، دەخوازم ئەم کتێبە بەشێك لەو مێژووە شێوێنراوەی سەردەمی دەوڵەتی ئەیوبیو صەلاحەدینی ڕاست کردبێتەوەو دکتۆر توانیبێتی وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە وەکو خوێنەری ڕاستەقینەی ساڵانێکە بەدوایدا دەگەڕێ.




**ئارام عەلی سەعید**

**هەڵە بجەی شەهید**

٢٠٠٦/٩/١

## دەربارەی صەلاحەددین‌و مێژووی کورد لە سەدەکانی ناوەڕاستدا

پاش ئەوەی ساڵی (٢٠٠٢) لە شاری هەولێر دەربارەی صەلاحەددینی ئەیوبی کاك (بەدران ئەحمەد) گفتوگۆیەکی لەگەڵ ئەنجامدام، بۆ جاری دووەم لەگەڵ نووسەری بەڕێز (ئارام عەلی سەعید) گفتوگۆیەکی ترمان بە مەبەستی لە چاپدانی لە کتێبێکدا سازکرد، سەرجەم پرسیارو وەڵامەکانیش لە ڕێگای تۆمار (تسجیل) کردنەوەکراوە، چوارچێوەی پرسیارو وەڵامەکانیش بەپێی ئەوەی کە لەنێو هزرمدا ماوەو لە دەرس‌و موحازەرەکانی بەغداو هەولێرو دهۆك‌و دیاربەکرو ئیزمیرو مصراتە (لیبیا)و شوێنەکانی تر وتوومەتەوە، هەروەها لە سیمینارو کۆڕەکاندا پێشکەشم کردووە، وەڵامەکانم داونەتەوە، ئەوەی یەکەم بەناونیشانی (نناشد صلاح الدين ام نحاسب أنفسنا، استجواب قائد بعد ثمانمأ سنة) لە شاری هەولێر لە لایەن دەزگای "ئاراس"ەوە بە چاپ گەیەنرا، ئێستا کراوە بە کوردی لە لایەن (ئاواز جاف)ەوە، بەناوی (صەلاحەددین بدوێنین یان خۆمان بە بەرپرسیار بزانین).

ئەم دیدارەی دووەمیش بەشێوازی زارەکی‌و لەڕێگای تەسجیلەوە لە چەند دانیشتێکدا لە زانکۆی صەلاحەددین ـ کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سلێمانی ـ کۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەکان‌و چەند شوێنێکی تر کراوە، تایبەت بە ڕۆڵ‌و کەسایەتی صەلاحەددینی ئەیوبی‌و دەوڵەتەکەیان‌و ئەو گومان‌و تەمومژەی کە لەسەریان دروست دەکرێت.

دەمەوێت لێرەدا ئاماژە بەوە بکەم کە هەڵە تێگەیشتن لە نێوڕۆڵەکانی گەلی کورد هەیە سەبارەت بە سەرکردەیەکیان (صلاح الدين الأيوبي)، بە بێئاگاو بەبێ هەژمارکردنی کات‌و شوێن‌و سەردەمەکان کە صەلاحەدین تێیدا ژیاوەو ئێستاش ئێمەی تێدا دەژین، ئەمەش ئەو هەستەی لا دروست کردم هەروەکو وایە (داوا لە کەڵەشێر بکرێت هێلکە بکات) کە بەر لە (٣٠) ساڵ پێش ئێستاش ئەوەم وتووە.

گەلێك کە سەرکردەیەکی وەکو صەلاحەددینی هەبووبێت چاوەڕوان دەکرێت کە هاو وێنەی جارێکی تر دروست بێتەوە، لەوانەشە سەرکردەی لەو هەڵکەتووتری تێدا دروست بووبێت لە مێژوودا، بەڵام کام مێژوو؟ ئەو مێژووەی کە کورد خۆی لە ئەنجامی دواکەوتوویی شارستانی نەیتوانی بینووسێتەوە..! !

سەدان ساڵ پێش ئێستا هیچ کام لە باپیرانی ئێمەش گرنگییان بەمە نەداوە، جگە لە (الفارقي، أحمد يوسف علي بن الأزرق) لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا (دوازدەی زایینی) کاتێك کتێبە بەنرخەکەی دانا بەناوی (تاريخ ميافارقين وآمد) و (د. بدوي عبداللطيف عوض) پێشەکی بۆ نووسیوەو توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی لەسەر کردووە، (طبع دار الكتاب اللبناني، بيروت ـ عام ١٩٧٤، "طبعة الثانية" الأولى كانت ١٩٦٥) هەروەها (ابن المستوفي هەولێری، ت ٦٣٧ه ـ ١٢٣٨م)، کتێبی (نباهة البلد الخامل بمن وردة من الأماثل في تأريخ أربل) کە (أ. د. سامي الصفار) توێژینەوەی بۆ کردووەو لە زانکۆی (کمبردج) لە ئینگلتەرا پلەی دکتۆرای بەدەست هێناوە لە بەغدا، ساڵی ١٩٨١ چاپکراوە.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەم کە یەکەم کەس ناوی نیشتمانەکەمانی هێنا (کوردستان)، کورد نەبوو، لە کاتی قسەو باسی تایبەت بە مێژووی کورددا ناوی نەهێناوە جا ئەوکەسە (ابن العبري) بێت، یان ئەوانەی پێش ئەو، یان (حمدالله المستوفي) لە سەدەی هەشتەمی کۆچی.

لێرەدا ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ئەمە مانای ئەوە نییە کە گۆڕەپانی کوردستان خاڵی بووە لە بەسەرهات‌و ڕووداو، یاخود دەرکەوتنی سەرکردە، بەڵام بەداخەوە خاڵیبووە لە نووسەرو مێژوونووسی کوردو بەرهەم‌و نووسراوەکانیان (دانراو) ونبووە یاخود لە ناوچووەو کەس باسی نەکردووە، ئیدی وا دەرکەوتووین کە ئێمە خاوەنی مێژوو نین‌و نەمان بووە، هەر بۆیە کاتێك

پێویستمان بە سەرچاوەی مێژوویی هەیە لە کتێبو بەڵگەنامە تاوەکو ڕێ نیشاندەرمان بن و ئاسانکارییمان بۆ بکەن لە چۆنییەتی ڕووداوەکان، ئەوە هەرگیز مێژوو نییە ! هەروەك هەردوو مێژوو نووسی فەرەنسی (سینو بوس ولانجلوا) جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەوەی سەرچاوەو بەڵگەنامەی مێژوویی نەبێت، خاوەنی مێژوو نییە..

لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدا، ئایا چۆن کوردستان توانیویەتی پارێزگاری لە شارستانییەتیو ڕۆشنبیریو زمانو ئەدەبو فۆلکلۆرو دابو نەریتو.. تاد کردووە، لەکاتێکدا ئەمانە نەبوونەتە بەربەستو ڕێگر لەبەردەم توانەوەیان لە نێو عەرەبو فارسو تورکەکاندا ؟

وەلامی ئەم پرسیارە لەوەدایە کەسانێك هەبوون و پاراستوویانن، جگە لە چیا بڵندو گەورەکان لە کوردستانی گەورەدا، کە ئەوانە وەکو سەربازی نەناسراوو پارێزەری نیشتمان بوون، لەبەر ئەوە سەرچاوە مێژووییەکان باسیان ناکات، چونکە هۆشیاری مێژوویی لاواز بووەو بایەخی پێنەدراوە.

دەتوانین بڵێین صەلاحەددین یەکێکە لەو کەسە ئازاو لێهاتووانەی کە وەکو ئەستێرەیەکی پرشنگدار لە ئاسمانی پاڵەوانێتیدا درەوشاوەتەوە، بەهۆی زیرەکیو بەرزی مرۆڤبوونیەوە کە نموونەی پێدەهێنرێتەوە، لە کاتو شوێنی گونجاودا دەرکەوت تاوەکو توانی لەو کاتو شوێنەدا ئەو پلەو پایە گرنگە بەدەست بێنێت، چونکە ئەرکێکی زۆر قورسو گرانی خستبووە سەرشانیو بووە خاوەنی هەڵوێستو بڕیار.

کەواتە ئەو گەلو نەتەوەیەی کە پاڵەوانی وەکو صەلاحەددینی تێدا دەرکەوتبێت، ئەوا شیاوی ئەوەیە کەسانی لەو گرنگتریشی تێدا سەرهەڵبدات.

تا کاتی هاتنی ئەم سەرکردەیە لە زەمینی کوردستاندا کەس نەبووە مێژووی کوردستان بنووسێتەوە، بەلام لە بنەماڵەی ئەیوبییەکاندا هەبووە کە لە شام لە شاری (حماە) دەژیانو خاوەنی شارەکەشبوون لەو ڕۆژگارەدا مێژوویان نووسیوەتەوە، وەکو کوڕەزاکەی شاهەنشای برای صەلاحەددین ئەویش موحەممەدی کوڕی تەقیەددین عومەرە، دانەری کتێبی (مضمار الحقائق وسر الخلائق)، مامی باوکی صەلاحەددین بووە کە هاوسەردەمی بووە، بەلام زۆربەی کتێبەکانی ونبووە تەنها هەواڵی ڕووداوەکانی سالانی (٥٧٥، ٥٧٧، ٥٨٠، ٥٨٢ك) نەبێت.. (هامش هذا الکتاب حققه، أ.د. حسن حبشي، طبع في دار الکتب، القاهرة، ١٩٦٨).

هەروەها مێژوونووسی ئەیوبی ئەبولفدا ئیسماعیل کوڕی مێژوونووسی ناوبراو (محمد تقي الدین عمر) دانەری کتێبی (المختصر في أخبار البشر) کە بە سەدەو نیوێك لەدوای مامی باوکی صەلاحەددین کۆچی دوایی کردووە.هەر بۆیە ئەو خێزانە خوێندەوارە ئامادە نەبوون دانیشن دەستەوئەژنۆو هەواڵو ڕووداوەکانی سەردەمی صەلاحەددین نەنووسنەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بایەخیان بە مێژووی خۆیانداوە، بەلام کە دیارو ڕوون بێت هیچ شتێکیان لە بارەی کوردو کوردستانەوە نەنووسیوە، بەلام (ئیبن خەلەکان کوردی هەولێری، ت ٦١٨ھ ـ ١٢٨٢م)، ناوی هەندێك لە سەرکردەو ناودارانی کوردی لە نێو زیاد لە (٨٣٠) ناودار تۆمار کردووەو تایبەتمەندێتیی زۆری داوە بە صەلاحەددینو بەدرێژی باسی لێکردووە بە پشت بەستن بە کتێبی هەندێك لە هاوسەردەمانی ئەو سەرکردەیە، وەکو (ابن شداد، ابن الأثیر) و.. هتد. کە لە ساتەوەختی گەڕانیدا لە نێوان دیمەشقو قاهیرەدا کتێبەکەی داناوە، لەوکاتانەدا کە بێکاربووەو هەروەها کاتێك کە قازی میسرو شام بووە.

**دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن**

**هەولێر ـ کۆلێژی ئاداب ـ بەشی مێژوو**

## مێژوو و صەلاحەددین

حوکمی مێژوو یەك حوکمەو هەرگیز ناگۆڕێت، (کروتشە) دەڵێ: "هەموو مێژوویەك مێژووی هاوچەرخەکەی خۆیەتی"[1]، بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی لەبەرئەوەی مرۆ کائینێکی بەرژەوەند خوازبووەو هەمیشە لە دووی ئەوە گەڕاوە باشترین ناوو ناوبانگ بۆ خۆی فەراهەم بێنێتو زۆرترین دەسەڵاتو فراوانخوازیی بۆ بگەڕێتەوە ئەو بۆچوونەی لا گەڵاڵە بووە کە خەراپەی خۆیو نزیکەکانیو هۆزو تەنانەت هاوبیرەکانیشی نەڵێت، هەروەکو لە بەرامبەردا بۆ ئەوانی دی پێچەوانە بووەتەوە، بەڵکو ئەوە نەزانراوە ئامانجو مەبەستی مێژوو زانی تێگەیشتنی ڕابردووە وەك خۆی کە چۆن بووە نەك وەك ئەوەی کە چۆنمان بوویت، لەسەردەمەکانی پێش مێژوو ئەم سەردەمەش، مێژوونووسی وا بووەو هەیە بەپێی بیروباوەڕی خۆیان مێژوویان لێکداوەتەوە، خۆیەکیو سەپاندنی ئاکارێکی تایبەت، مێژوو ئەشێوێنێتو لە مەبەستە ڕەسەنەکەی خۆی دووری دەخاتەوە،ڕاستە مێژوونووسو هەرکەسێکی دی دەست لەبیرو باوەڕەکەی خۆی هەڵناگرێت، بەلاّم نابێت بەسەر لێکۆڵینەوەیدا بسەپێنێتو لەڕێبازی زانستی لای بدات. پێویستە بۆ ڕاستکردنەوەو گۆڕینی بیروڕای بەپێی داکەوتو ڕاستییەکانی ڕووداوەکانی ڕابردوو کراوە بێت[2].

لە کتێبی (حقبة من التأريخ)دا هاتووە دەڵێ: بە ئەندازەی خوێندنەوەو ڕاڤەکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، خوێندنەوەو موتالاّی مێژوو دەقەکانی گرنگو بایەخدارە[3]، لە ئیسلامدا زۆر گرنگی دراوە بە شارەزابوونو ئاشنایەتی مێژووی ڕووداوەکانی ڕابردوو، بەڵگەی دیاریش گێڕانەوەی چیرۆکە قورئانییەکانە، کە پانتاییەکی بەرفراوانی لە نێو تێکستە قورئانییەکاندا داگیر کردووە.

دکتۆر کەمال مەزهەر دەڵێ: "مێژوو زانستی زانستەکانە"[4]، کەواتە تێکڕای زانستەکان بە گەڕانەوەو دەورانی مێژووییان کەینونەی خۆیان ساغ دەکەنەوە، ئینجا کە مێژوو هێندە بایەخداربێت، دەستنیشانکردنو پشتبەستن بە سەرچاوە مێژووییەکانیش لە ڕووی ڕەسەنایەتییەوە کۆڵەکەی ڕاستی بنەماکانی مێژوو زانین، بۆ نموونە مێژوونووسە ئیسلامییەکان یاخود ئەوانەی دەیانەوێ ڕاستییەکانی ڕابردوو وەکو خۆیان ڕاڤە بکەنو بخەنە ڕوو، (تأريخ الطبري) باس دەکەن لەبەر ئەم فاکتەرانە:

١- نزیکی نووسینەوەو سەردەمەکەی ناوبراو لە ئەسڵی ڕووداوەکانەوە.

٢- هەموو سەنەدو گێڕانەوەکانی بە بەڵگەوە بەدوای یەکدا هێناوەو ئاماژەی بە شاهیدەکان کردووە.

٣- بەرزی ئاستی زانایی و پێگە و گەورەییو بەتوانایی ئیمامی تەبەری.



٤- زۆربەی مێژوو نووسە دیارەکان و ئەوانەی نەیانویستووە دووچاری هەڵەی مێژوویی بن پشتیان بە نووسینەکانی ئەم مێژوو نووسە بەستووە[5].

هەروەکو پێشتر ئاماژەم پێدا هۆکار زۆرە بۆ ئەوەی مرۆ وا بیربکاتەوە تا بەو شێوەیە خۆی ویستی چۆن بێت مێژووەکەش وا ئاڕاستە بکات، (ئایدیۆلۆژیا، جەنگو دوژمنایەتی، جیاوازی ئاینی و فیکرو.. تاد) ململانێو بوونە کۆلۆنیالیزمی خاکی نێوان

---

١ د. أحمد محمود صبحي، في فلسفة التأريخ، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٩٤.

٢ فوئاد تاهیر سادق، هۆشیاری مێژوویی، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١.

٣ عثمان بن محمد الخميس، حقبة من التأريخ، المملكة العربية السعودية، توزيع دار ابن الجوزي، الطبعة الثانية، ٢٠٠٣.

٤ د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو، بەغداد، کتێبخانەی نیشتمانی، ١٩٨٣.

٥ عثمان بن محمد الخميس، حقبة من التأريخ، المملكة العربية السعودية، توزيع دار ابن الجوزي، الطبعة الثانية، ٢٠٠٣.

گەلانو نەتەوە جیاوازەکان دژ بەیەك، یان بە هۆکاری دەوڵەتداریو بونیاتنانی لەبەر کۆمەڵێك بنەمای گشتیو پاشان ناکۆکیو ڕاجیایی لەسەر دروست بوو بێت و نەتەوە ژێردەستەکان هەڵوێستی پێچەوانەترو دژیان بۆ پەیدا بووبێ، لەمێژووی ئیمپراتۆرو دەسەڵاتەکانی دنیادا ئەوە هەبووە کە نەتەوەیەك یاخود نەژادێکی تایبەت بەهۆی بوونی کۆمەڵێك فاکتەری بنچینەییو بەرجەستەیی چەند ڕەهەندێکی گرنگ جڵەوی دەسەڵاتیان بە دەستەوە بووەو بوونەتە سەردەستێکی فەرمانڕەوا، هەروەکو عەرەبەکانو تورکەکانو فارسەکانو هەندێك نەتەوەی دی بچووك، ئەمانە بەر لەوەی بنەمای نەتەوە ڕایەڵی گەیاندنیان بووبێ بە دەسەڵات، بنەمای ئایین یاخود خێڵو هۆزگەرایی پاڵنەری سەرەکیان بووە بۆ پایەکانی فەرمانڕەوایەتی، لەبەرئەوە لە سەردەمە کۆنەکاندا بەتایبەتی بەر لە سەدەی هەژدەو نۆزدەیەمینی زایینی کە نەتەوەگەرایی لە نێو گەلاندا چەکەرەی نەکردبوو دەوڵەت لە سەر بنچینەی نەتەوایەتی دانەمەزراوە، بیروباوەڕی نەتەوایەتی باو نەبووە.. بەڵکو ئەو هێزو دەسەڵاتانەی کە دەوڵەتیان دامەزراندووە ئایینی و هۆزانەبوون، بۆ نموونە دەوڵەتی (ئاشوور) بە ناوی خوا (ئاشوور)[1] بووەو پەرستیارەکانی دایانمەزراندووە هەروەها دەوڵەتی بابلیو کاشیو کوردو فیرعەونەکانی میسرو جوو دەسەڵاتی ناوچەی ترەوە هاتبوون[2]، ئینجا دەوڵەتی ئیسلامیی پێغەمبەر ﷺو خولەفای ڕاشیدینو ئومەویو عەبباسیو عوسمانیو ساسانیو ڕۆمو .. تاد، هەموویان لەسەر بنەمای ئایینیو دەسەڵاتی خێڵەکی دروست بوون، هەربۆیە ناکۆکیو ململانێکانیش لەسەر ئەمانە بوونو شەڕەکانیان شەڕی ئایینیو فراوانخوازیی دەسەڵاتو قەڵەمڕەوی بووە لەسەر خاکی یەکتری.

لێرەوە پێویستە مێژوونووسو مێژووزانەکانیش لە کاتی تۆمارکردنی ڕووداوو خوێندنەوەی سەردەمەکانی مێژوودا پۆلێنو جیاکاری ئەمانە بکەن، چونکە بەپێی گۆڕانو هاتنەپێشەوەی قۆناغە یەك لەدواییەکانو بە ئەندازەی پێشکەوتنی گەلانو ڕەوڕەوەی ژیان زەمەنەکان گۆڕانو بەرەو پێشەوە چوونیان بە خۆوە بینیوە، ئیدی نووسینەوەی سەردەمە مێژووییەکان دەکەونە بەردەم دوو ڕەوتی جیاواز، یەکەمیان: ئەو ڕەوتەیە کە مەبەستیەتی مێژوو بشێوێنیو ئەو جیاوازیانە دەرفەتی لەباری بۆ دەڕەخسێت تاوەکو ئامانجو ستراتیژەکانی بهێنێتە دی، دووەمیان: ئەوانەن کە بێئاگاو نەشارەزان لە ڕەوتی ڕووداوو قۆناغە جیاجیاکانی مێژوو، ئەو نەزانییە دەیانخاتە هەڵەیەکی مێژووییەوەو دوچاری قەیرانی نادروستیان دەکاتەوە، کە لە میتۆدی ڕێبازی لێکۆڵینەوەو مێژووی نووسینی بێلایەنانە لایان دەدات.

بەداخەوە هەندێ لە مێژوونووسان و بەناو ڕۆشنبیرەکانی کوردیش زۆرجار ڕووبەڕووی ئەم دووجۆرە هەڵە کوشتندەیە دەبنەوە کە بە مەبەستو بێ مەبەستو ناتوانن لە حەقیقەتەکانی ڕابردوو بگەن، یەکێك لەو هەڵە تێگەیشتنانە کە بەڕاستو چەپدا لێی دەدرێت باسی سەرکردەی بەناوبانگی مسوڵمانی کورد (صەلاحەددین ئەیوبی)ە، تاوەکو ئێستا نەتوانراوە بە فۆرمێکی ڕێکوپێكو بێ لایەنگیریانەو بێ مەبەست کۆراییو یەکدەنگی لە نێو دنیای ڕۆشنبیری کوردیدا سەبارەت بە ڕۆڵو گرنگیو نرخی مێژوویی ئەو قارەمانە دروست بکرێتو زۆرێك لە کوردەکانیش هەروەکو عەرەبەنەتەوەییە شۆڤێنیزمەکان لەبەردەم هەڵەی گەورەی تۆمەتبارکردنی صەلاحەددین–دان کە پەیوەستە بە هەستی نەتەوایەتیو کوردبوونو عەرەببوونی ناوبراوەوە، کاتی خۆی حزبی بەعسیش لە بڵاوکراوەکانیدا لەسەر صەلاحەددینی ئەیوبی، لەو جێیانەدا کە صەلاحەددین

---

[1] ئاشوور: ناوی گەورە خوای ئاشورییەکان بووەو دەوڵەتەکەشیان بەناوی ئەوە ناونرابوو. پایتەختەکەیان کە لەسێیەم هەزارەی پێش زایین دروستکراوە هەر بەو ناوەوە بووە.

، فوئاد تاهیر سادق، هۆشیاری مێژوویی،دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، ٢٠٠١.

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

سەرکەوتووەو حەکیمانە کاریکردووە، دەڵێ: "ئەو پاڵەوانە عەرەبییە"، بەڵام کە شکستییەکی بە سەرهاتووە دەڵێ: "من دم کردي" یان "من نسب وأصل کردي"[1].

یان لە سەردەمی جەمال عەبدولناصری میسردا نووسەرو مێژوو نووسەکانی ئەو وڵاتە بەرەهایی کەوتبوونە ژێر کاریگەری بیروبۆچوونە شۆڤێنستەکانی ناصرەوەو بە باری عەرەبچێتیو رەگەزپەرستیدا لێی دەدوان، تاوەکو ناوبراو مرد، لە دوای مردنی هەموو ئەو نووسەرە بەناوبانگانە پەشیمان بوونەوە لەو بۆچوونانەی کە پێشتر هەیانبووە سەبارەت بە صەلاحەددینی ئەیوبی.

کەواتە ئەو مشتومڕی جیابیرکردنەوەیەی کە بەرامبەرە بە (یوسف صلاح الدین) لە دنیای نوێدا هەبووەو هەیە دابەشبووە لە نێو عەرەبە نەتەوەیی‌و کوردە نەتەوەییەکاندا، لە لایەن عەرەبەکان بە عەرەبێکی رزگارکەری خاکەکەیانی دەزانن، لەلایەکی دیکە کوردەکان بەکوردێکی خیانەتکاری دەزانن‌و خوازیاری دەوڵەتی کوردی بوون لەو سەرکردەیە کە بۆ نەتەوەکەیانی دورست نەکردووە.

تێکرای نووسەرو رۆژهەڵاتناس و ئەوروپییەکان ئەوانەش کە نەیاری بوون دان بەوەدا دەنێن کە سەرکردەیەکی کوردیی (kurdish leader) بووە، هەندی لەو عەرەبانەیش نەیانویستووە مێژووی صەلاحەددین‌و سوپاکەی بشێوێنن دانیان بەو راستییەدا ناوە، ئەوەتا (د. عصام محمد شبارو) لە کتێبی (السلاطین في المشرق العربي)دا کاتێ باسی مەمالیکەکان[2] دەکات لە سوپای ئەیوبییەکاندا دەڵێت: "گەورەترین پێکهاتەی سوپای ئەیوبییەکان لە کوردەکان پێکهاتبوون لە دوای کوردەکان مەمالیکەکان بووە..".

مێژوونووسە کوردەکانیش ئەوانەی نەیانویستووە رۆڵی قارەمانێتی‌و نێوبانگی ون بکەن تواناو هەوڵەکانی صەلاحەددین–یان بە بایەخەوە خستووەتە روو، شەرەفخانی بەدلیسی (شەرەفنامە)، موحەممەد ئەمین زەکی بەگ (مێژووی کوردو کوردستان)، صاڵح قەفتان (مێژووی کورد لە کۆنەوە تا ئەمرۆ). زۆرێکی تریش.

ماوەی چەند ساڵێکە ژمارەیەکی زۆر نامەی ماستەرو دکتۆراو دەیان لێکۆڵینەوەی تر لە زانکۆکانی کوردستاندا لەسەر لایەنە جیاوازەکانی ژیانی صەلاحەددین دەنووسرێت‌و زانیاری وردترو بابەتی نوێ لەسەر تێکرای بوارەکانی مێژوویی ئەم ئاشکرا دەکرێت، بەڵام هێشتا وەکو پێویست نەبووەو نەتوانراوە هەروەکو لە تورکیاو لیبیا ئیسرائیلی جوو کۆنگرەی باڵا لە ئاستی وڵاتاندا بۆ صەلاحەددین بەسترا لە چەند ساڵی رابردوو، سەرباری ئەمانەش‌و بڵاوکردنەوەی دەیان نامەو لێکۆڵینەوەو نووسراو نەتوانراوە بۆ سەرکردەیەکی کورد کە لەوڵاتی خۆماندا لە دایکبووەو ناساندنی بە هەموو جیهان لە کۆنگرەیەکدا بە بابەت‌و نووسین‌و بۆچوونەکان بخەینە روو، ئەمیش تەنها هۆکاری بوونی ئەو شەپۆلە عەلمانییەتە باوەیە کە بە هزرو تێڕوانینێکی قەومیانەی ناسیۆنالیستانەوە لە مەڕ ئاستی باڵای سەرکردەیەکی مسوڵمانی کوردییەوە دەڕوانێت کە زیاتر لە هەشت سەد ساڵ بەر لە ئەمرۆ کۆچی دوایی کردووە، لە سەردەمی ململانێی نەتەوەگەرایی‌و بیری ناسیۆنالیستانەدا دەیانەوێت دادگایی سەردەمێك بکەن کە هەموو ناکۆکی‌و رووبەڕووبوونەوەکان لە رووی ئاینی‌و دینەوە بووە، ئەمەش بێئاگاییەکی دیارو ئاشکرایە کە عەلمانییەتی کوردی خۆی لێ گێل دەکات‌و کۆمەڵێك بە ناورۆشنبیر گشت زەرەرو زیانەکانی پاش سەرهەڵدانی بیری نەتەوەگەرایی لە نەتەوەی کورد دەخەنە ئەستۆی کەسێك کە سەردەمەکەی دوور بووە لە بوونی

[1] حەسەن مەحمود حەمەکەریم، کابانی کوردیی، سلێمانی، ١٩٩٧.

[2] مەمالیکەکان: بنچینە رەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ کۆیلە سپییە ئاسیاییەکان کە لە تورك‌و چەرکەس پێکهاتبوون، دانیشتوانی رەسەنی وڵاتی قیبجاق بوون لە دەوری ڕووباری قۆڵغالە باکووری دەریای رەش‌و قەوقاز، لە کاتێکدا بە هۆی هەژاری‌و برسێتییەوە خێزانەکانیان بازرگانییان پێوە دەکرا، ئەوەبوو ساڵح ئەیوب (٦٣٨ ـ ٦٤٧ك)، (١٢٤٠ ـ ١٢٤٩ز) لە دەوڵەتی ئەیووبییدا ژمارەیەکی زۆری لێ کڕین‌و لە دوای ژمارەی کوردەکان لە سوپای ئەیوبییدا، مەمالیکەکان بوون. بڕوانە: د. عصام محمد شبارو، السلاطین في المشرق العربي، دار النهضة العربیة، بیروت، ١٩٩٤.

سنووری نەتەوەیی‌و چوارچێوەی جوگرافیایی‌و لە بێ دەسەڵاتی ئێستادا قسەی نابەجێ‌و ڕەخنەی ڕوخێنەرو هەڵوێستی نازانستیانە بەرامبەری دەنوێنن.

دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن یەکێکە لەو مامۆستایانەی کە زیاتر لە نیوسەدەیە لاپەڕەکانی مێژوو هەڵدەداتەوەو بە بایەخەوە لە دووی ڕاستییە مێژووییەکان دەگەڕێت، نامەی ماستەرو دکتۆراو چەندین کتێبی لەمەڕ صەلاحەددینی ئەیوبی نووسیوەو پسپۆڕی‌و شارەزایی لە بوارەکانی ژیانیدا وەرگرتووە، لە زۆرێك لە کۆنگرە جیهانییەکان کە بۆ صەلاحەددین بەستراوە بەشداربووە، دەیان کۆڕو سیمینارو لێکۆڵینەوەو بابەتی جیاوازی پێشکەشکردووەو لە گۆڤارە عەرەبی‌و ناوخۆییەکاندا بڵاویکردۆتەوە، ماوەی چەند ساڵێکە لە زانکۆی بەغدا گەڕاوەتەوە کوردستان و سەرپەرشتی نامەی دکتۆراو ماستەرەکانی زانکۆکانی (سلێمانی، کۆیە، صەلاحەددین، دهۆك) دەکات، لەبەر پێویستی‌و گرنگی بابەتەکەو شارەزایی‌و ئاستی ئەکادیمی‌و زانستی ناوبراو گفتوگۆیەکی چڕو پڕمان لەگەڵ ئەنجامدا، زۆرێك لەو پرسیارانەمان ئاڕاستە کردووە کە لەنێو دنیای ڕۆشنبیری کوردیدا تاوەکو هەنوکە دەکرێت‌و وەڵامەکانیان بە ڕوونی نەخراوەتە ڕوو، وەیاخود نەبووە، دکتۆر موحسن وەکو مێژووزانێکی کوردی هەولێرو بێلایەنانەو بێ دەمارگیری ئایدۆلۆژی ئایینی‌و نەتەوەیی بە ڕاشکاوی وەڵامی پرسیارەکانی داوینەتەوە، ئومێدەوارم تینوێتی هەموو ئەوانە بشکێنێ کە بە دوای ڕاستییەکاندا دەگەڕێن‌و نایانەوێ مێژووی چەواشەکراو بخوێننەوە، ئەوانەشی کە بە هەڵە لە چالاکیی‌و جموجووڵەکانی سەرکردەی ئیسلام صەلاحەددین گەیشتوون، ئەمە بیانگەیەنێتە قەناعەتی ڕاستی.



## صەلاحەددین کێیە؟

صەلاحەددین یوسف کوڕی نەجمەدین کوڕی ئەیوب ساڵی (٥٣٢ك ـ ١١٣٧ز) لە قەڵای تکریت لە دایکبووە، ئەو ڕۆژەی ناوبراو لە دایك دەبێت فەرمانڕەوای بەغدا (موجاهیدەددین بەهرۆز)، فەرمانی کرد نەجمەدین ئەیوب لەگەڵ شێرکۆی برای شاری تکریت بە جێ بهێڵن، لەبەر ئەوەی شێرکۆی مامی صەلاحەددین یەکێك لە سەرکردەکانی قەڵاکەی کوشتبوو، ئەوەبوو ماڵو منداڵیان بەڕێخست بۆ موسڵ لەکاتی کۆچکردنیاندا صەلاحەددینیان بوو.

صەلاحەددین ماوەیەك ژیانی منداڵی لە بەعلەبەگ بەسەر بردو سوارچاکی و ڕاهێنانی کردووە لەسەر جەنگو جیهادو سیاسەتو ئیشوکارەکانی سوپا.

خاوەنی کتێبیی (طبقات الشافعية) دەڵێت: صەلاحەددین خوێندنی لە لایەن (حافظ ابي طاهر السلفي) و (ابي الطاهر بن عوف) و شێخ (قطب الدين النيسابوري) و (عبدالله بن بري النحوي) و هەندێکی تر خوێندووە، قورئانی پیرۆزو زۆربەی فەرموودەکانی پێغەمبەری ﷺ لەبەر بووە.

لە پاش ئەوەی وردە وردە فێری سوارچاکیو ڕمبازیو ئازایەتی جەنگ دەبێت صەلاحەددین لەگەڵ شێرکۆی مامیدا دەچێت بۆ میسر، شێرکۆی مامی لە دەوڵەتی فاتمییەکاندا دەبێتو فەرمانڕەوایی بەدەستەوە دەبێت، لەدوای دوو مانگ لەو دەسەڵاتەی کە پێی درابوو کۆچی دوایی دەکات، ئەوەبوو خەلیفەی فاتمییەکان (العاضد) بیری کردەوە لە هەڵبژاردنی وەزیرێك بۆ خۆیو بڕیاری یەکجارەکی لەسەر (یوسف صلاح الدين)دا لەدوای مامی ببێت بە وەزیرو نازناوی (مەلیك ناصر)ی پێدرا، لەو کاتەوە بە (الملك ناصر صلاح الدين) ناوبرا[١]، ئەو کاتە تەمەنی (٣٢) ساڵ بوو، ئەوەی زیاتر ناوبانگی پێ دەرکرد سەرکەوتنی بوو بەسەر خاچ دروشمەکاندا پاش هێرش بردنیان بۆ سەر (دمياط) و (غزة)و داگیرکردنی شاری (العقبة) کە کلیلی دەریای سووربوو بۆ ڕێگای حاجییە میسرییەکان بۆ مەککە[٢].

صەلاحەددین توانی مەملەکەتێکی مەزن دروست بکات، کە پێکهاتبوون لە باکوری عێراقو شامو میسرو بەرقە، ئەوەبوو توانی لە شەڕی بەناوبانگی (حطين) (٥٨٣ك ـ ١١٨٧ز) بە سەر خاچدروشمەکاندا سەرکەوێت، هەروەها شاری قودسی لە دەستیان ڕزگار کردو ئەمە بووە ناوبانگێکی جیهانی بۆی کە لە هەموو دنیادا بەسەرکردەیەکی ئازاو لێهاتووی وڵاتی ئیسلام ناسرا.

ژیانی صەلاحەددین تاوەکو سەرەتای ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی یانزەیەمینی زایینی بەردەوام بوو، ئیدی نەخۆشی سەری لێداو لەدوای یازدە ڕۆژ لەو نەخۆشییە لە شانزەی سەفەرەی ٥٨٩ك ـ ١١٩٣ز کۆچی دوایی کردو لە قەڵای دیمەشق بەخاك سپێردرا، لە پاش سێ ساڵ لە مردنی، کوڕەکەی مەلیك (فاضل) گۆڕێکی لە تەنیشت مزگەوتی ئەمەوی لە دیمەشق بۆ دیاریکردو لە ڕۆژی عاشورادا گواستیانەوە بۆ ئەو شوێنە.




---

1 شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفخانی، وەرگێڕانی هەژار موکریانی، لەلایەن کۆڕی زانیاری لە چاپ دراوە، بەغدا، ١٩٧٣.

2 صلاح الدين قارەمانی (حطين)و ڕزگارکەری قودس، عبدالله ناصح علوان، وەرگێڕانی باوکی عەبدوڵڵا، هەولێر، ٢٠٠٠.

## تەوەرەی یەکەم:

## کورد لە سەردەمی فەرمانڕەوایانی ئیسلامدا

**+ ئێمەی کورد لە ئێستادا چۆن دەتوانین ئاماژە بە مێژووی خۆمان بکەین لە سەردەمی فەرمانڕەوایانی ئیسلامدا هەر لە چەرخی پێغەمبەرایەتییەوە (موحەممەد) ﷺ کە خەڵکی لە زۆربەی شوێنەکانی دنیاوە مسوڵمانبوونی خۆیان بۆ ڕادەگەیاند تا وەکو کۆتایی ئەو سەردەمەی کە مێژووی مسوڵمانان کۆتایی پێهاتووە؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد حوسێن: هەندێك لە مێژوونووسەکان ئاماژەیان بەوە کردووە کە یەکێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری ﷺ کورد بووە بەناوی (گابان) یان (جابان)[١] بووە، چەندین فەرموودەیان لەسەر زمانی پێغەمبەرەوە ئاماژە پێکردووە سەبارەت بەم کوردە کە پەیوەندی کردووە بە ئیسلامەوە لەو سەردەمەدا، بەڵام ئەم مێژوونووسانەی کە وتم نزیکەی پێنج سەد ساڵە باسی (گابان) دەکەن.

لەدوای ئەوەی سوپای ئیسلام کە هاتە کوردستانو سەرەتا لە باشوورو خوارووی عێراقەوە دەستیان پێکردو دواتر چوونە وڵاتی فارسو ناوچەکانی تری کوردستان، ئەوەبوو کوردەکان ئاینی تایبەتی بەخۆیان هەبوو کە بریتیبوو لە ئایینی (زەردەشتی)[٢]، تێنەدەگەیشتن کە ئەم سوپا ئیسلامییەو ئەم سەربازە عەرەبیانە کە هاتوون چییان دەوێت! دیاربوو عەرەبەکان وایاندەزانی کە هەموو کەس زمانی عەرەبی تێدەگاتو مەبەستەکانی ئەمان دەزانێ بۆچی هاتوون، ئیدی لە پاش سەرسامبوونیان کوردەکان هەمیشە وابیریان دەکردەوە کە ئەمانە کێنو دەبێت چۆن لەیەکتری بگەین تاوەکو بزانین چییان دەوێت؟

ئەوەبوو کوردەکان دەستیانکرد بە بەرەنگاربوونەوەی سوپای ئیسلامو شەڕی توندیان کرد، بەڵام دواتر بۆیان روون بوویەوە کە هێزی ئیسلامیی کۆمەڵێك مەرج و داواکارییان هەیە تاوەکو مامەڵەو هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کوردەکاندا بکەن[٣]، ئیدی کوردەکان وازیان لەجەنگ هێناو زۆربەیان بەو مەرجانە ڕازی بوون[٤]، زۆربەی تریشیان پەیتا پەیتا پەیوەندییان کرد

---

١ حەسەن مەحمود حەمە کەریم ئەو بۆچوونەی ئەمین زەکی بەگ دێنێت کە دەڵێ: (قەومی کورد وەکو تەئریخی موعتەبەر ئەڵێن لە شانزەهەمین ساڵی کۆچیدا بەرامبەر (٦٣٧ز)دا لە دوای فەتحەی لوانو تکریت لەگەڵ ئۆردوی ئیسلامدا تەماسیان کرد.. بەڵام پێویستە بزانین لەپێش ئەم تەئریخەدا بەعزێ تەماسو ئیهترادی کورد واقیع بووە مەسەلەن مەرحوم ئالوس ئەفەندی لە تەفسیری (روح المعاني)دا لە ناو ئەسحابی کیرامدا باسی جابان (کابان)ی کوردی مەیمونی کوڕی ئەکاکە کونیەی تری کوردیش بووبێت..)، ئەمە بەلای نووسەرەوە پەسەندە، کابانی کوردی، حەسەن مەحمود، ١٩٩٧، ل ١٣ ـ ١٤.

٢ زەردەشت: میستەرجان دەڵێ لەنیوەی دووەمی سەدەی حەوتەمی پێش زاین هاتۆتە دنیاوەو لە نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەمدا مردووە، زەردەشت کوڕی پورشسب کوڕی پێرسپ لە ناوچەی ورمێ (ڕەزائیە) هاتۆتە دنیا.. (حەسەن مەحمود، ئاینی کورد لە تۆفانی نوحەوە تا سەرەتای ئیسلام، چاپی سێیەم، ١٩٩٨، لا١٦٧). نامەی ماستەرموسا موحەممەد خدر، هەولێر، ٢٠٠٥.

٣ مەرجو داواکانیان بریتیبوون لە سێ خاڵی سەرەکی، یەکەم: مسوڵمانبوونو هاتنە سەر ئایینی ئیسلام، دووەم: ئەگەر ئاینی ئیسلام قەبوڵ ناکەن ئەوا با جزیە بدەن، جزیە واتا جەزا، پاداشتی ئەوەی بیاندایە بە دەوڵەتی ئیسلامییو ئیدی ژیانو ماڵو سامانیان پارێزراو بوو، هەروەها مانەوەیان لەسەر ئایینەکانی خۆیان (مەسیحی، جوولەکە، مەجوسی، زەردەشتی،.. تاد)، بوو، سێیەم: ئەگەر ئەم دوانەیان جێبەجێنەکردایە ئیختیاری سێیەمیان بوو کە زۆربەکەمی ڕوویدەدا.

٤ واتا جزیە یاخود سەرانەیاندا لە بەرامبەردا زەمانەتی هەموو بوارەکانی ژیانیان کرا.

بەهێزی ئیسلامەوەو موسڵمان بوون، یانی کەس ناتوانێ ڕۆڵی کورد لەسەرەتای مێژووی ئیسلامدا وەلا بنێ، کوردەکان توانییان بایەخی باش بە ئیسلام بدەن لەو کاتانەدا کە سەرەتای فەتحی ئیسلامی بۆ ئەم ناوچانە دەستی پێکرد[١].

بەڵام لەسەردەمی دەوڵەتی ئومەویدا[٢] ئومەوییەکانو عەرەبەکانی تریش زۆر بە چاوی سووك سەیری کوردەکانیان دەکردو دەیانوت هیچ ماقووڵ نییە ئێمەی عەرەب کە (فاتح)ین بەیەك چاو سەیری هەموو میللەتەکان بکەین لەگەڵ عەرەبدا، کە ئەوان وڵاتەکانیان (مفتوح) بووە بۆ ئێمە، لەبەر ئەوە ئەوان بوونەتە (مەوالی)[٣] ئێمە.

هەرچەندە زۆرێك وای باس دەکەن کە زۆر بەچاوی سووك سەیری کوردەکان کراوە، من لەگەڵ ئەم بۆچوونانەشدا نیم کە دەڵێن لەو کاتەدا ئومەوییەکان وتویانە: "ئەوانەی نوێژ بەتاڵ دەکا، بریتین لە: سەگو بەرازو مەوالی"، ئەمە هیچ کات ڕاست نییە، ئەگەر ڕاست بووایە ئەوا دەبوو هەموو کورد ئەگەر عەقڵیان هەبووایە وازیان لە ئیسلام بهێنایەو شەڕیان هەڵبژاردایەو ڕووبەڕووی یەکتر بوونایەوە، چونکە هیچ قبوڵ نییە مەوالی و سەگ و بەراز لای ئومەوییەکان یەك حسابیان هە بووبێت، ئەوەیان لەوانەیە دیعایەی ئەوانە بێت ڕقیان لە کوردەکان بووە، لەبەر ئەوەی تێکەڵ بە کەلتوری ئیسلامیی بوون.

بەڵام ئەوە دەڵێم کە ئومەوییەکان لەو ئیسلامە ڕەسەنەی کە پێشتر هەبوو لایاندابوو، ئەو لادانەی ئەوان وایکردبوو کە جیاوازیو تەماشاکردنی میللەتەکانی تری غەیری عەرەب لایان دروست بێت.

هەر ئەمانەش بوون وایانکرد کوردەکان کە لەڕیزی مەوالیدا حسابیان بۆ دەکرا کاتێ کە (خەوارج)[٤]ەکان دروست بوو، بوون بە (خەوارج)، واتا چوونە ناو سەربازەکانی (خەوارج)ەکانەوە، چونکە هەستیان بە ستەم دەکرد، وە فارسەکانیش بوون بە (شیعە)[٥] نەچوونە ناو خەوارجەکانەوە.

لێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێم کە (مەروانی کوڕی محەمەد)[١] دایکی کوردبووە لە ناو ئومەوییەکاندا، بەڵام ئەمە نەبووە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی کە کوردەکان بەشداری لە شۆڕشی خەواریجدا نەکەن، لەبەر ئەوە ئەو زەواجە زەواجێکی سیاسیی بووە کە کراوە، نەك بۆ هەندێك ڕێگری لە بەردەم جیاوازییەکاندا.

---

[١] مێژوو لە نێوان کوردو ئیسلامدا هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی تۆمارنەکردووە، کە سوپای ئیسلام دەگەنە جەلەولا گوڵاڵەو لەو جەنگەدا سەردەکەون، نوێنەری خەڵکی شارەزوور دەگەنە جەلەولاو ڕێککەوتنێك مۆردەکەن، ئەو کاتە کوردستان خاڵی کرابوو لەسەربازی فارسیو هەموو کێشکرابوویەوە بۆ بەرەی جەنگی جەلەولاو حەلوانو خانەقین، کورد ئەو فرسەتەی قۆستەوەو لەگەڵ سوپای ئازادی بەخشی ئیسلامیدا ڕێکەوتن. (کوردستان لە بەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا، حەسەن مەحمود حەمە کەریم، چاپی سێیەم، سلێمانی، ٢٠٠٢).

[٢] دەوڵەتی ئومەوی ساڵی (٤١)ی کۆچی لە پاش تەسلیمکردنی خیلافەت لەلایەن ئیمامی حەسەنی کوڕی عەلی ئەبی تالبەوە لەسەردەستی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دامەزراو تاوەکو ساڵی (١٣٢) کۆچی بەردەوام بوو.

[٣] مەوالی: لەسەردەمی ئومەوییەکاندا بەوانە دەگوترا کە غەیری عەرەب بوون، واتا عەرەب نەبوونو لە بنەماڵەی ئومەوییەکان نەبوون وەکو کوردو تورکو فارسو نەتەوەکانی دی. بڕوانە نامەی ماستەری نەریمان عەبدوڵڵا سلێمانیی ٢٠٠٥.

[٤] خەوارجەکان: ژمارەیان (١٢) هەزار کەس بوون کە لە ناو سوپای مسوڵماناندا لە سوپاکەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب (٣٥ ـ ٤١)ی کۆچی لە ئەنجامی ڕشازیبوونی ئیمامی عەلی بە تەحیکم لەگەڵ موعاویە لە جەنگی سەفینا (٣٧) ی کۆچی جیابوونەوەو ڕازینەبوون بەو ڕێککەوتنە. پێشیان دەڵێن (شوراتەکان)، بڕوانە کتێبەکەی مصلح مستەفا جلالی (شوراتەکان) دار الحریة، بغداد (ب. س).

(الخلفاء الراشدون بين الأستخلاف والأستشهاد، د. صلاح عبدالفتاح الخالدي، دار القلم، دمشق، الدار الشافيبة، بيروت، الطبعة الثانية، ١٩٩٩). ئەم کتێبە وەرگێڕاوە بۆ زمانی کوردیی، بەڵام من سوودم لە دەقە عەرەبییەکەی وەرگرتووە.

[٥] شیعە: بەوانە دەوترا کە پڕوپاگەندەیان دەکرد کە ئیمامی عەلی تایبەتمەندی خۆی هەیە بەپێی دەقو فەرموودەو وەسیەتی پێغەمبەر ﷺ، باوەڕیان وابوو کە ئیمامەت نابێت لەنەوەکانی ئەو دەربچێت، ئەگەر دەربچێت ئەوە ستەمە، ئەمانیش لە پێنج بەش پێکهاتبوون (كيسانية، زيدية امامية، غلاة، اسماعيلية).

ئەو شیعە مەزهەبانەی کە ئێستا لە زۆربەی وڵاتان بوونیان هەیە هەریەکەو بەپێی تایبەتمەندی خۆیان مێژووەکەیان بۆ ئەوان دەگێڕنەوە. (الملل والنحل، الشهرستاني، مطبعة دار الفكر، بيروت، ٢٠٠٥).

ئینجا ئەو کوردانەشی کە بەشدارییان لە شۆڕشی خەواریجدا کردووە هەر لە ناوچەکانی خۆیاندا نیشتەجێبوون، بەڵام دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە بەردەوام ئەم شوێنی نیشتەجێ بوونانەی کوردەکان بەدرێژایی مێژووی ئەو سەردەمانەش کەم دەبوویەوە، هەرگیز زیاد نەدەبوو، تەنانەت زۆر لە هۆزە عەرەبییەکان وەکو (مضر، بکر، ربیعة).. تاد، بەهۆی بەرتەسکبوونەوەی زەوییەکانی کوردستان ئەوانی لێ جێگیر دەبوون.

ئێمە ئەوەمان لەبیر نەچێت پێغەمبەر ﷺ ئەگەر خۆی بمایە هەرگیز ئەوەی قەبوڵ نەدەکرد یەك بستە خاکی نەتەوەیەکی ترو میللەتێکی تر کە غەیری عەرەب بن لەلایەن هیچ کەسێکەوە داگیر بکرێت یاخود دەستی بەسەردا بگیرێت، چونکە ئەوە لە ڕەفتاری ئەو نەدەوەشایەوە، ئەوجیاوازی لە نێوان کەسدا نەدەکرد، ئەوەتا (سەلمانی فارسی، صوهەیبی ڕۆمی، بیلالی حەبەشیو .. تاد)[٢] لە گەڵیدا بوون ئەگەر عروبەو دەمارگیری عەرەبچێتی دورگەی عەرەبی لە مێشکیدا بووایە هەرگیز ئەمانەی نەدەگرتە خۆیو لە جەماعەتەکەشی دوور دەخستنەوە.

پـێویستە ئـەوەشمان لە بیر نەچـێت کاتێ سـوپای ئیـسلام فـەتحی هـەر شوێنێکی بکردایە نەدەچوو کەسێکی تر دابنێت لە غەیری خۆیان، بەڵکو هەر لە فەرمانڕەواو دەست ڕۆیشتووەکانی ناوچەکانی خۆیان خەڵکیان دادەنا بەڵام بەو مەرجەی کاتێ ناوچەکەیان فەتح دەکرا ئەو کاربەدەستانە مسوڵمانبوونی خۆیان بۆ ڕاگەیاندنایە، بەهەمان شێوەش کوردەکانیش وابوون لە زۆربەی شوێنو ناوچەکانی خۆیاندا خۆیان فەرمانڕەوایی ناوچەکانی خۆیان کردووە بەڵام بەناوی دەسەلاتداریێتیی مسوڵمانەکانەوە، نەك کوردەکان بەڵکو زۆربەی نەتەوە جیاوازەکانی تری ناوچە ڕزگارکراوەکان بەهەمان شێوەش کەمسوڵمان دەبوون جڵەوی دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی ناوچەکانیشیان بۆ خۆیان دەبوو.

هەتا فارسەکان لەبەر ئەوەی زیرەکیو لێهاتوویان پێوە دیاربوو، پێغەمبەر ﷺ خۆی بەدەقی فەرموودە ئیعترافی بەلێهاتوویيو توانای فارسەکان کردووە کە لە ناو مسوڵمانەکاندا بوون، (ئەو بە عەجەم ئاماژەی بۆ کردوون) لەبەر ئەوە ئایینی ئیسلام ئاینێکی جیهانی بێ جیاوازی بوو لە ڕوئیای پێغەمبەرەوە ﷺ بەیەك چاو تەماشای هەموو میللەتەکانی تر دەکرا بە پێچەوانەی جوولەکەکانەوە کەپابەندبوون بە نەتەوەیەکی دیاریکراوەوە.

**+ حەز ناکەم بەوردی بچینە ناو مێژووی ئیسلام بەتایبەتی سەردەمی دەوڵەتی ئومەویو عەبباسی، لەبەر ئەوەی بابەتەکەی ئێمە پەیوەستە بەمێژوویەکەوە کە بەشێك لە کارەکتەرەکانی پێوەندی بە دەوڵەتی عەباسییەوە هەیە ئەویش (مێژووی سەرکردەیەکی کوردییە کە ناسراوە بە صەلاحەددین)، دەتوانی باسی ڕۆڵی کوردمان بۆ بکەیت لە ڕووخانی دەوڵەتی ئومەویدا؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: سەرەتا حەزدەکەم ئەوە بڵێم دوایین خەلیفەی ئومەوییەکان کە (مەروان) بوو لە شەڕێکدا لە کوردستان بەناوی (معرکة الزاب)[٣] ساڵی (١٣٢ك ـ ٧٤٩ز) ڕایکرد چووە وڵاتی شام، لەبەر ئەوە سەردەمی فتوحات کە



---

[١] مەروانی کوڕی محەمەد، دوایین خەلیفەی ئومەوییەکان بوو کە بۆ دواجار جڵەوی فەرمانڕەوایی لە نێو ئومەوییەکاندا گرتە دەست، لەقەبێکی تری هەبوو بەناوی (مروان الحمار).

(البداية والنهاية، ابن كثير، مجلد ١٠، دار البيان الحديثة، الطبعة الأولى، قاهرة، ٢٠٠٣).

[٢] ئەم سێ کەسە هاوەڵی نزیکی پێغەمبەر بوون ﷺ، غەیری عەرەب بوون (سەلمانی فارسی، خەڵکی وڵاتی فارس بوو، (سوهەیبی ڕۆمی) لای ڕۆمەکانەوە هاتبوو، (بیلالی حەبەشی) خەڵکی حەبەشە بوو، شیاوی باسە ئەم سێ کەسە لە سەردەمی بانگەوازی ئیسلامیدا هاتن بۆ مەککەو ئیسلامبوونی خۆیان بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیاند.

[٣] معركة الزاب: واتە زێ، کەوتۆتە نێوان هەولێرو موسڵ.

لەسەردەمی (وەلیدی کوڕی یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیك)[1] وە جارێکیتر دەستی پێکردەوە لە چەرخی ئومەویدا کە ناوچەکانی باکوری ئەفریقاو ئەندەلوس و تەواوکاری هەندێ لە شوێنەکانی ئاسیایان کرد، ئەوەبوو دوای ئەمانە فتوحاتی ئیسلامی ڕاوەستا لەسەردەمی ئومەوییەکاندا، چونکە ئاژاوەو ڕووبەڕووبوونەوە لەژێر فەرمانڕەوایی دەوڵەتەکەدا زۆر پەرەی سەند هەر لە شەڕکردن لەگەڵ خەواریجەکان تاوەکو وەستان بەرامبەر بە شۆڕشی عەبباسییەکان کە لەژێر دروشمی (ڕەزامەندی بوونەوە لە بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ)، (الرضا من آل البيت) بەرامبەر بە دەوڵەتی ئومەوییەکان بەرامبەریان دەیاننواند، بۆ دواجار عەبباسییەکان توانییان بیانڕوخێنن، کوردەکانیش یەکێك لەو نەتەوانە بوون کە بەشدارییان لەڕووخاندنی دەوڵەتی ئومەوییەکاندا کرد، بە بێ ئەوەی عەبباسییەکان جیاوازییان بکەن لەگەڵ خۆیاندا، چونکە هەروەکو پێشتر باسمکرد دروشمی عەباسییەکان تەنها ڕازیبوون بوو لە ئەهلی بەیت.

**+ لە سەردەمی دەسەڵاتیی ئیسلامییدا چەندین قەوارەو میرنشینی کوردی دامەزراون بەتایبەتی لە چەرخی عەبباسییەکاندا، تا چەندە سەر بەخۆبوون و دەسەڵاتیی قەڵەمڕەوییان لە سنووری میرنشینەکەیاندا بۆ خۆیان پارێزراو بوون؟ ئایا ئەو دەسەڵاتە گەورانە نەبوونە کۆسپ و لەمپەر لەبەردەم خواستی دەسەڵاتیی میرنشینە کوردییەکان؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: بەڵێ هەندێ لەو قەوارانە وەکو میرنشینی (مەروانی)[2] کە لە کوردستانی باکور بوو دور بوو لە مەرکەزی دەسەڵاتەوە، هەروەها میرنشینی (عەنازی)[3]، میرنشینی (حەسنەوی)[4] و چەندین میرنشینی تر کە لە سەردەمی دەوڵەتی عەبباسییەکاندا هەبوون، ئەمانە هەموویان میرنشینی کوردی بوون و جۆرێك لەسەربەخۆیی خۆیان هەبوو لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی و دەسەڵاتیی ئیسلامیدا، نەك هەر کوردەکان بەڵکو لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا ئەو قەوارەو دەسەڵاتی ناوچەییانە کە هەبوون لە کاتێکدا کە سەر بە مەرکەزی دەسەڵات بوون لە بەغدا بەڵام بۆ خۆیان سەربەخۆبوون، هەرچەندە ئەمە لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەویدا جیاوازتربوو، چونکە پێوەندی ئەو میرنشینانە لە سەردەمی ئومەوییەکاندا زیاتر پەیوەست بوون بە مەرکەزەوە بەڵام عەبباسییەکان نەیانتوانی ئەو پێوەندییە بەردەوامی پێ بدەن، چونکە عەبباسییەکان تەنها بەناو دەسەڵاتیی مەرکەزییان هەبوو، دەوڵەتێکی لاواز بوون.

لە سەردەمی یەکەمین خەلیفەی ڕاستەقینەی عەبباسییەکاندا (ئەبو جەعفەری مەنسور)[5]، ئەندەلوس سەربەخۆیی خۆی وەرگرت کە ئومەییەکانی لێ بوو (عبدالرحمن الداخل)[1]، لەسەردەمی (هارونی ڕەشید)[2] (مەغریب)[3] سەربەخۆیی خۆی

---

[1] وەلیدی کوڕی یەزید لە دوای هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکی مامی لە ساڵی (١٢٥ك) دەسەڵاتی گرتە دەست کە تەمەنی سیو چوار ساڵ بوو، پێشتر کاتێك باوکی مردبوو وەسیەتی کردبوو براکەی کە هیشام بوو دەسەڵات وەربگرێ، لەپاش ئەویش کەمرد وەلیدی کوڕی بێتە فەرمانڕەوا، ئەوەبوو وەسیەتەکەی جێبەجێ کراو ئەو ڕۆژەی هیشام مرد خەڵکی بەیعەتیان بەوەلیدی برازایدا.

(البداية والنهاية، ابن كثير، مجلد ١٠، دار البيان الحديثة، الطبعة الأولى، قاهرة، ٢٠٠٣).

[2] میرنشینی مەروانی: ئەم میرنشینە لەناوچەی دیاربەکر لە دەوروبەری ساڵی (٣٧٣ك ـ ١٩٢٨ن) وەکو دەسەڵاتێکی سیاسی دیار کەوتووە، دامەزرێنەری میرنشینەکە میربادی کوڕی میر دۆستەکی کوردییە. الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، د. عبدالرقيب يوسف، بغداد، ١٩٧٣.

[3] میرنشینی عەنازی (٣١٨ك ـ ٩٩١ن): لە ناوچەی حەلوان لە نێو کوردانی هۆزی شازەنجانی دەرکەوت.

[4] میرنشینی حەسنەوی (٣٤٨ك ـ ٩٥٩ن): لە سەر دەستی میر حەسنەوی کوڕی حوسێنی کوردی دامەزراوە کە سەرۆك خێڵی بەرزیکانی بوو لە هەرێمی چیاکان. بڕوانە نامەی ماستەری دکتۆر حسام الدين علی غالب نەقشبەندی (الكورد في الدينور وشهرزور في القرن الرابع والخامس الهجريين).

[5] ئەبو جەعفەری مەنسور: ناوی تەواوی عەبدوڵلای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەباسەو دووەمین دەسەلاتی دەوڵەتی عەباسییە کە لەدوای ئەبوعەباسی سەفاح بوویە فەرمانڕەوا. الطبري: تأريخ الرسل والملوك.

(البداية والنهاية، ابن كثير، مجلد ١٠، دار البيان الحديثة، الطبعة الأولى، قاهرة، ٢٠٠٣)

وەرگرت کە (ئەداریسەکان)[٤]ی لێبوو، لەبەر ئەوە ئێمە لێرەدا باسی کوردەکان دەکەین نەك هەر کوردەکان بەڵکو عەرەبەکانیش لەسەردەمی دەسەڵاتیی عەبباسییەکاندا سەربەخۆیی خۆیان وەرگرت.

هەر بۆیە عەبباسییەکان ئەگەرمەرکەزی دەسەڵاتەکەیان بپارێزرایە ئیتر هیچ کێشەیان نەبوو، بۆ نموونە کابرایەك بە ناوی (ئیبراهیم الأغلب)[٥] کە هۆزێکیان هەبوو بەناوی (الأغلب) بانگیان کرد وتیان وەرە سەربەخۆییت دەدەینێ لە (تونس)[٦] داوا سوپای خۆتان هەبێو پارەمان بۆ مەنێرە، بەڵام ببنە بەربەستێك لەبەردەم ئەداریسەکان کە شیعەی عەلەوی بوون و مونافیسی عەبباسییەکان بوون، بۆ ئەوەی نەیەنە تونس، چونکە ئەگەر تونس داگیر بکەن ئەوا دێنە (بلاد برقة، واتا لیبیا)[٧]و دواتر دێنە میسرو جێگا بەئێمە لێژ دەکەن، ئەمە سێیەم دەوڵەت بوو لەوڵاتی عەرەبیدا کە سەربەخۆیی وەرگرت.

دوای ئەمانە لە میسردا تۆلۆنییەکان هەبوون کە سەرکردەکەیان (ئەحمەد تۆلۆن)[٨] بوو، ئەوانیش سەربەخۆیی خۆیان وەرگرتو پارەو ئاڵای خۆیان هەبوو تەنها بە ناو سەربە دەوڵەتی عەبباسی بوون و لە وتاری هەینیدا ناوی خەلیفەو ئەمیرەکانی ئەوانیان دەهێنا، هەتاوەکو دوای تۆلۆنییەکانیش "ئەخشیدییەکان هاتنە سەر حوکم"و لە پاشان (فاتیمییەکان)[٩] هاتن، ئەوانیش سەربەخۆیی خۆیانیان وەرگرت بە تەواوی.

**+ ئەمانە هەموو لە لاوازکردنی عەبباسییەکانەوە بوو؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: بەڵێ، عەبباسییەکان هەرگیز بە هێزنەبوون، چونکە فارسەکان هەبوون، کاتێك دەیانتوانی بەهێزبن کە فارسەکان نەمێنن، ئەگەر چی نەیانتوانی فارسەکان لاواز بکەن، چونکە ئەرستۆکراتییەتی فارسەکان بەشداریی هەبوو لە دەسەڵاتیی عەبباسیدا، لەبەر ئەوە لەسەرەتای دەوڵەتی عەبباسییەوە تاوەکو کۆتایی هەموو وەزیرەکانی ئەو دەوڵەتە فارس بوون، جگە لە یەك وەزیر بەناوی (أبو أیوب المورياني)(١٠)، هەروەها (بەرمەکییەکان)(١١)یش کە دەوری گرنگیان بینی لە دروستکردنی دەوڵەتی عەبباسیدا کە دواتر هاورنی ڕەشید دەستیکرد بەلابردنیان.

---

[١] عبدالرحمن الداخل: لە بنەماڵەی ئومەوییەکان بوو، توانی خۆی ڕزگار کات لە دەست عەباسییەکانو گەیشتە وڵاتی (ئەندەلوس)و دەوڵەتی ئەمەوی بوژاندەوە لەوێ.

[٢] هارون الرشید: خەلیفەی عەباسی لە دوای باوکی (مەهدی) بوویە دەسەڵاتدار لە ساڵی (٧٠)ی کۆچییدا کە تەمەنی بیستو دوو ساڵ بوو. (البداية والنهاية، ابن كثير، مجلد ١٠، دار البيان الحديثة، الطبعة الأولى، قاهرة، ٢٠٠٣).

[٣] یەکێکە لە وڵاتە عەرەبییەکان لە ڕۆژگاری ئەمەوییەکاندا ڕزگار کراوە (٦٢هـ ـ ٦١٨م). بە سەرکردایەتی عوقبەی کوڕی نافع. (الطبري. وابن الأثير).

[٤] ئەداریسەکان (١٧٣ ـ ٣١١هـ) (٧٨٨ ـ ٩٢٣م): شیعەی عەلەوی بوونو مونافەسەیان لەگەڵ عەباسییەکاندا دەکرد کە لە مەغریبی عەرەبیدا بوون، شاری (فاس)و (مەکناس) لە سەردەمی ئەواندا لەوێ دروستکران.

[٥] لە نەوەی ئیبراهیمی کوڕی ئەغلەب (ابراهيم ابن الاغلب)ن لە وڵاتی (تونس) دەوڵەتێکیان دامەزراند (١٨٤ ـ ٢٩٦ك) (٨٠٠ ـ ٩٠٨م) هەمان سەرچاوە.

[٦] ئەم وڵاتە عەرەبییە لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان ڕزگار کراوە ساڵی (٢٧ك ـ ٦٤٧م) لە سەردەستی عەبدوڵڵای کوڕی سەعد. (الطبري. وابن الأثير)

[٧] لیبیا لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب فەتح کراوەو لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان تەواو بووە، هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٨] سەرکردەی تۆلۆنییەکان بوو لە میسر لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسیدا.

[٩] فاتمییەکان (٣٥٨ك ـ ٩٦٩ز): لەسەردەمی خەلیفە ئەلموعیز (المعزالدين الله الفاطمي) دەوڵەتەکەیان دامەزراو لە سەردەمی خەلیفە عازد (العاضدالدين الله الفاطمي) کۆتایی پێهات (٥٦٧ك ـ ١١٧ز).

[١٠] أبو أيوب المورياني: وەزیری خەلیفە مەنسوری عەبباسی بوو لە ئەهواز، هەر لەوێش لەدایکبووە.

[١١] بەرمەکییەکان: بەشدارییەکی بێ سنوورو بێ وێنەیان کرد لە دامەزراندنی دەوڵەتی عەباسی، بەڵام پاشتر هارونی ڕەشید گشتیانی سەرکوت کرد.

لەو سەردەمەدا میرنشینەکانی ولاَتی فارس دەستیان کرد بە وەرگرتنی سەربەخۆیی خۆیان کە میرنشینەکانی (تاهیری)، (سامانی)، (سەفاری)یەکان[١] هەبوون.

ئینجا ئەو کاتە کوردەکان هەستیان کرد کە دەسەلاَتیی ناوەندی مەرکەزی لە بەغدا لاوازە، ئەوەبوو بڕیاری سەربەخۆیی میرنشینەکانیاندا، میرنشینەکانی (مەروانی)، (دۆستەکی)، (حەسنەوی)، (عەننازی) هتد. لە دوای ئەمانە دەولَەتی عەبباسی کەوتە دەستی بوەیهیو سەلجوقییەکان لەڕووی دەسەلاَتەوە تەنها خەلیفە لە بەغداد مابوو، ئەگینا ناوچەکانی تر ئەو هێزانە کۆنترۆلَیان کردبوو، لەلایەکی ترەوە جگە لەوەی کە دەولَەتی عەبباسی لاوازبوو، لەهەمان کاتدا گشت ئەو میرنشینانەی کە هەبوون خۆیان دەیانووت ئێمە سەر بە ئێوەین لەکاتێکدا عەباسییەکان ئەهلی بەیت بوونو کوردەکانیش مسولَمان بوون، بەلاَم هەر دەیانووت سەر بەئێوەین، دەبینین تاوەکو سەدەی بیستەمیش گشت سەرکردەی شۆڕشەکانی کورد پیاوی ئاینی بوون، یەکێك شێخە، یەکێك قازییە، یەکێك مەلایە، یەکێك ساداتی بەرزنجەیە، قادریە، نەقشبەندییە.. هتد، واتە وەك ئەو نەمرانە: (شێخ عوبەیدوللاَی نەهریی، شێخ سەعیدی پیران، مەلا مستەفای بارزانی، قازی موحەممەد، شێخ مەحمودی حەفید..)، یانی ئێمە کە میرنشینو سەر بەخۆیی خۆشمان هەبووبێ لە دین دەرنەچووینو ویستوومانە وەکو میللەتەکانی تردەولَەتمان هەبێتو ئێمەش ئیسلامین.

### تەوەرەی دووەم

### صەلاحەددینو کوردو خاچدروشمەکان

**+ زۆرێك لە مێژوونووسانی عەرەب بنەمالَەی ئەیوبییەکان و صەلاحەددین بەڕەچەلَەك دەبەنەوە سەر (مضر) کە دەچێتەوە سەر هۆزی عەدنانی عەرەبی[٢]، چۆن دەتوانیت بە بەلَگەی مێژوویی ئەمە ڕاست بکەیتەوە.**

دکتۆر موحسین موحەممەد: بەلَگەی مێژوو دەبێ چی بێ زیاتر لەو کتێبانەی سەردەمی صەلاحەددین دانراونو نووسراون، لەبەر ئەوە عەرەبە ڕەگەزپەرستەکان چاویان بەرایی نادات کە کەسانێکی ڕێکوپێك سەرهەلَبدات لە مێژووی ئیسلامیدا مەگەر هەردەبێت عەرەب بێت، ئەگەر چی گشت پیاوەکانی مێژووی شارستانییەتی عەرەبی هیچیان عەرەب نین، ئەوان تێڕوانینیان وایە لەکاتێکدا قورئان بەزمانی عەرەبی بووەو عەرەب خاوەنی مێژوویەکی دوورو درێژەو تاوەکو دوێنێ ئەوانەی غەیری عەرەب بوون مەوالی بوون، چۆن دەبی سەرکردەیەکی ئاوا لەپاش ئەوە لەمێژووی ئیسلامدا هەلَکەوێت کە دەبێ کورد بێ، بەلاَم بۆچوونی هەموو عەرەبەکان وانییە، ئەوانیش خەلَکیان هەیە بە ئینسافەوە باسی سەرکردەی مسولَمانی کورد صەلاحەددینی

بروانە: الطبري، أبو الطقطی، الضخري، وجودت هولد "البرامكة مالهم وماعليهم".

[١] سێ میرنشینی جیاواز بوون لە ولاَتی فارس (ئێرانی ئێستا) لە سەردەمی دەولَەتی عەباسیدا دروست بوونو سەر بەخۆیی تەواوی خۆیان وەرگرتبوو.

[٢] عەرەبی عەدنانی بە ڕەچەلَەك دەچنەوە سەر ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام) کە ناسراون بە عەرەبی (مستعربة)و بە خوێن ناچنەوە سەر عەرەبی ڕەسەنو تێکەلَ بوون لەگەلَ غەیری عەرەبەکاندا. (السیرة النبویة، علی محمد محمد الصلابي، المجلد الأول، دار النشر للتراث، الطبعة الأولی، قاهرة، ٢٠٠٣).

ئەیوبی دەکەن کە کورد بووەو توانیویەتی دەوڵەتێکی گەورەی ئیسلامیی دروست بکاتو خاکی ئیسلام لەژێر دەستی خاچ دروشمەکان دەربهێنێ.

پێش چەند ساڵێك لەمەوبەر (١٩٨٩) بوو لە گۆڤارەی (ڕۆشنبیری نوێ)ی بەغدا، ژمارە (١٢٤)، کابرایەك بەناوی (عبدالحميد يونس السامرائي) ئەگەر ناوەکەم لەبیر نەچووبێتەوە، وتارێکی نووسیی کە هۆزەکانی کوردی کردبوو بە عەرەب لەژێر ناونیشانی (ئەم هۆزە کوردانە لە بنچینەدا عەرەبن) لاپەڕە (١٦ ـ ٢٢). بە بێئاگاداری دەستەی نووسەران، ئەوەبوو ئێمە وازمان لەو گۆڤارە هێنا، بەڵام ئەوەی مەبەستمە بڵێم ئەوان ڕەوانابینن کەسێکی وەکو ئیمامی غەزالی فارس بێت، بەیرونی عەرەب نەبێت، کەسێکی وەکو فارابی خەڵکی وڵاتی فاراب بێت[١]، دەبینی کەسێکی وەکو (ئیبن خەلدون)[٢] کە بنچینەی زانستی کۆمەڵناسیو فەلسەفەی مێژووی داناوەو خۆی عەرەبەو کەس ناتوانی نکۆڵی لێ بکات، دەڵێت (جل العلماء المسلمين من الأعاجم)، دەڵێ، چونکە عەرەبەکان سەرقاڵی حوکمو دەسەلات بوون، مەیدانەکانی زانستو زانیاریو ئەدەبو مێژوو تەفسیرو فەرموودەو زانستی گەردوونناسیو جوگرافیاو فیزیاو کیمیاو ئەندازیاریو.. تاد، هەمووی لە دەستی ئەوانەدابوون کە غەیری عەرەب بوون، کوردەکانیش لە مانەدا بەشداربوون وەکو (ابن خلكان)[٣]، (ابن الأثير)[٤]، هەروەها فەقیهی بەناوبانگ (ابن صلاح الشهرزوري)[٥] هەروەها لەگەڵ ئەمانەشدا خۆیان یەکی نازناوێکی عەرەبیان بەخۆیانەوە ناوە وا هەستیان دەکرد ئەم ناوە تەشریفیان دەکات.

یەکێ لە مامۆستاکانی زانکۆی میسر (نظير حسان سعداوي) ناوی دەوڵەتی ئەیوبییەکان بەم شێوەیە دێنێت (الدولة الكردية في مصر)، لەبەر ئەوە ئەم فیکرە نابەجێیە کەبڵاوبووەوە سەبارەت بە عەرەببوونی صەلاحەددین نووسەرو مێژوونووسەکانی سەردەمی (جەمال عبدالناصر)[٦] لە میسر بڵاویان کردەوە کە گوایە صەلاحەددین ئەگەر بە ڕەچەڵەکیش کورد بێت، ئەوا کەلەپورو شارستانییەکەی بریتیبوو لە کلتوری عەرەبیو بایەخدانەکانی زیاتر بۆ عەرەب بووە، من ئێستا زمانی عەرەبیم لە زمانی کوردی بەهێزترە، چونکە سیو پێنج ساڵ لە ناو عەرەبدا ژیاوم لە بەغداو لیبیاو وڵاتە عەرەبییەکانی تر، هەتاوەکو ماستەرو دکتۆرامان بە زمانی عەرەبی نووسییو تەواو کرد، یانی ئەمە بەڵگەیە لەسەر عەرەببوونی من؟! نەخێر، گرنگ ئەوەیە ڕەچەڵەکم کوردە، شانازیش بە کوردبوونی خۆمەوە دەکەم.




[١] ئەمانە چەندین زاناو فەقیهو مێژوونووسو کەسایەتی زانستی ئیسلام بوونو زۆربەی کتێبو بڵاوکراوەکانیان لە خزمەتی ئاینی ئیسلامدا بوون، بەڵام هیچیان کورد نەبوون.

[٢] ئیبن خەلدون: زانای دەروونناسو کۆمەڵناسی بەنێو بانگی عەرەبی خاوەنی چەندین کتێبی دیاری وەکو (مقدمة ابن خلدون، ، تاريخ ابن خلدون).. تاد، توانیویەتی لە ڕووی دەرونشیکاریو کۆمەڵناسیو توێژینەوەی وردەوە باس لە کەسایەتی تاك بکاتو قسە لەسەر شارستانییەکانو مۆراڵی کۆمەڵایەتی عەرەبی بکاتو بە شێوازێکی لۆژیکیانە لێیان بدوێ.

[٣] ابن خلكان: ناوی شەمسەدینی کوڕی ئەحمەد، لە شاری هەولێر ساڵی (٦٠٨ك ـ ١٢١١ز) لە دایکبووە، نازناوی خەلەکان لەناوی گوندێکی کوردستانە لە پارێزگای هەولێر–ەوە هاتووە، ساڵی (٦٨١ك ـ ١٢٨٢ز) لە دیمەشق کۆچی دوایی کردووە.

[٤] ابن الأثير: مێژوونووسێکی کورد بووە لە تەمەنی منداڵییەوە لە موسڵ لەگەڵ بنەماڵەی ئەتابەگییەکان لە موسڵ هەڵسوکەوتی کردووە.

[٥] ابن صلاح الشهرزووري: فەقێ زانایەکی پایەبەرزی کوردییە لە ساڵی (٦٤١ك ـ ١٢٤٣ز).

[٦] جمال عبدالناصر: ئەفسەرێکی نەتەوەپەرستی میسرە، لە ساڵی ١٩٥٢ کۆتایی بە سیستەمی مەلەکی هێنا لە کودەتای (٢٣ی تەمموزی) خۆیدانا بە سەرۆك کۆماری میسر، لە (١٩٥٤) تا مردنی لە ساڵی (١٩٧٠).

(ابن شداد)[١] و ابن الأثیر و (عماد الکاتب الاصفهانی) کە مێژوو نووسی سەردەمی صەلاحەددینن هەموویان دەڵێن صەلاحەددین کوردە، ئەو بۆچوونەش کە لەمیسر هەبوو لە سەردەمی عەبدولناسردا لە دوای مردنی جەمال عەبدولناصر ئەوانەی کە عەرەب چێتیتان دەکرد پەشیمان بوونەوەو وازایان لە ڕەگەز پەرستێتی عەرەبی هێنا (پ. د سەعید عبدالفتاح عاشور، الباز العرینیی، حسین مۆنیس) وتیان ئەو بۆچوونانەی هەمانبووە لەسەر صەلاحەددین هەڵەبووەو قەناعەتیان گۆڕی، من لە نامەی دکتۆراکەمدا کە لە ساڵی (١٩٨١) موناقەشەم کرد باسم لەوە کردووە کە پێکهاتەی بنچینەیی سوپای صەلاحەددین بریتیبوون لە کوردو تورك، بە بەڵگەشەوە سەلماندوومە تاکە یەك سەربازی عەرەب لەناو سوپاکەی صەلاحەددیندا نەبووە، بەڵام دکتۆر سەعید عەبدولفەتاح عاشور وتارێکی نووسیی لە گۆڤاری (المجلة العربیة للدراسات الأنسانیة)، لە زانکۆی کوەیت، کۆلێژی ئاداب، بەناونیشانی (البنیة البشریة في جیش صلاح الدین) ئیسپاتی کرد کە سوپاکەی صەلاحەددین یەك کەسی عەرەبی تێدا نەبووە، ئەمە لە پاش یازدە ساڵ لە نووسینەکەی من بڵاوبوویەوە بەمەرجێك ئەمە صەلاحەددین ـی ناو نابوو (من علام العرب صلاح الدین الأیوبي) واتە بە صەلاحەدین ـی دەگوت عەرەبە، زمانەکەی عەرەبە ! لەسەر خاکی عەرەب جموجووڵی سیاسیی و سەربازی کردووە.. تاد.

نموونەیەکت پێ بڵێم لەسەردەمی صەلاحەددیندا براکەی صەلاحەددین توغتکین فەرمانڕەوای یەمەن بوو ئەوەبوو کاتێك مرد کوڕەکەی هاتە جێگای، یەمەنییەکانیش نەتەوەکی دەمارگیرن بۆ مەسەلەی مەزهەب و خێڵگەرایی و عروبە، ئەدی چۆن قەبوڵ دەدەکەن کابرایەکی کورد فەرمانڕەوایی ئەوان بکات، ئیدی برازاکەی صەلاحەددین ئیسماعیلی کوڕی توغتکین بانگی کرد، وتی: بابە ئێمە کوردنین، بەڵکو عەرەبین، بەمەشەوە نەوەستاو وتی: نەك عەرەبین بەڵکو ئومەویشین، برایەکی صەلاحەددین کە ناوی (سیف الدین أبوبکر) بوو ناردی بەدوای ئەوبرازایەیداو پێی وت: ئەوە وتووتە ئێمە عەرەبین؟ ئیتر وەڵامی نەدایەوە، ئەبوبەکر وتی ئەوە ڕاست نییە (لا أصل لە أصلا)، نموونەیەکی تر (الملك الأفضل) عەلی کە کوڕە گەورەی صەلاحەددینە کاتی دەبێتە حاکمی دیمەشق، کەسێك کە شارەزایی هەیە لە ڕەچەڵەك و بنەماڵە و نەسەبدا بانگی دەکات کە بنچینەی بنەماڵەکەی ئەمان کە ئەیوبییە بدۆزێتەوەو بیسەلمێنێت کە ئەمان عەرەبن، ئەمە چیمان تێدەگەیەنێ، ئەوەمان پێدەڵێ کە زۆرکەس لە مێژووی ئیسلامدا هەبووە عەرەب نەبوون و کراون بە عەرەب، بەم شێوەیە، (دیاربەکر)، (دیار مضر)، (دیار ربیعة) بووەتە (دیار)ی عەرەبەکان و ئێستا دەڵێن ئەوە ناوی (دیار)ەکان عەرەبین، کەواتە ئەوانە بەشێکن لە شوێنی نیشتیمانی عەرەبەکان.

**+ باشە لێهاتوویی صەلاّحەدین وایکردبوو کە عەرەبەکان بیکەن بە عەرەب، یاخود چی بوو؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: نەخێر، بەڵکو پێیان نەنگی بووە صەلاحەددین عەرەب نەبێت، ئێستا ئەوەم وەبیردێتەوە من کاتی خۆی لە یەکێك لە ڕۆژنامەکانی بەغداشتێکم نووسی، بۆچی کاتی خۆی مەسعودی کوردەکانی کردووەتە عەرەب[٢]؟ من لەوێدا وتوومە مەسعودی لەوانەیە مەبەستی شکاندنی کوردەکان نەبێت کە دەڵێ عەرەبن، چونکە ناوبراو خۆی عەرەب بووەو کوردەکان زۆر ئازابوون، شانازی پێوە کردوون کە بڵێن لە منن و بە غەریبی تەماشایان مەکەن، من لەوێدا وتوومە لەوانەیە ئەونییەتەکەی چاك بووبێت، بەڵکو مەبەستی نەبووە کە دژایەتی کوردەکان بکات.

---

[١] ابن شداد: قازی بووە لە سەردەمی صەلاحەددینی ئەیوبیداو زۆربەی وردەکارییەکانی ژیانی ئاگادارە، لەبەر ئەوە زۆر لەمێژوونووسەکان لە نووسینەکانیاندا گەڕاونەتەوە بۆ بەڵگەکانی ئیبن شەداد لەسەردەمی صەلاحەددیندا، عماد الدین کاتب الّصفهانی ـیش یەکێك بووە لە مێژوو نووسە بەناوبانگەکانی فارسەکان کە لە سەردەمی صەلاحەددینی ئەیوبییدا ژیاوەو مێژووەکەی نووسیوەتەوە.

[٢] مەسعوودی مێژوونووسێکی عەرەبە لە کتێبی (مروج الذهب)دا ڕەچەڵەکی کوردەکان دەگێڕێتەوە بۆ ئەسڵی عەرەبی بە گوتەی ئەو لەنەوەو هۆزی (ربیع)ەی عەرەبین.

لەبەر ئەوە ئەمە تەنها بەکوردەکان دەگوترا لەلایەن عەرەبەکانەوە، چونکە کوردەکان قەوارەیان نەبوو، بەلاّم نەیاندەتوانی بەفارسەکان بلێن بەهۆی بوونی دەوڵەتو کیانی خۆیانەوە ! لەکاتێکدا زۆربەی نووسەری کتێبە عەرەبییە کۆنەکان فارسن، بەلاّم نەیاننووسیوە فارسەکان عەرەبن.

+ **ئێستاش عەرەبەکان هەمان بۆچوونیان هەیە؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: من لە پاش چەند جارێك لەم دواییانەدا توانیومە بچمە بەغدا، دیسان هەمان ئەو پرسیارەیان لێدەکردم، ئایا بۆچوونو قەناعەتی نوێت هەیە کە صەلاحەددین کورد نەبووبێت؟ من گوتم بەهیچ شێوەیەك لە مێژوودا شتی وا نییە، براکەم ئێستا نیەتی باش نەماوە کە بووترێت صەلاحەددین کوردە یاخود عەرەبە، لەلایەك دەڵێ مەعقول نییە صەلاحەددین ئەو هەموو عەرەبەی ڕزگارکردبێت، لەلایەکی دی دەڵێت کوردێك چۆن دەبێت ئێمە لەژێر فەرمانڕەوایە تیدابین ! ، ئەوە بەسووك سەیر کردنە، ئیدی ئەگەر صەلاحەددین ڕەگەز پەرستی بکردایە ئەویش دەچوو کاتی خۆی کوردایەتی دەکرد، بە لاّم ئەو کاتە بیرکردنەوەیەکی ئایینی هەبوو نەك بیرکردنەوەی ڕەگەزپەرستی نەتەوەیی، ئەگەر ئەمەیانی بکردایە ئەوا نەیدەتوانی هەرگیز ئەو ناوبانگە گەورەیە دەربکات کە هەموو جیهان ناسییانو مسوڵمانانیش شانازییان پێوە دەکرد، عەرەبەکانیش هەقوایە صەلاحەددین بکەنە ڕەمز، چ ڕەمزێك؟ ئەو ڕەمزەی کە بووە هەوێنی برایەتی کوردو عەرەب، ئەو ڕەمزەی کەتوانی بەبێ جیاوازی هەموو نەتەوەکان لەژێر ئاڵاکەیدا کۆبکاتەوە، لەبەر ئەوە صەلاحەددین لای وابوو لاوازی لەشی سیاسیانەی ئیسلام ماوەی بە دامەزراندنو دەوڵەتە سەلیبییەکانو مانەوەیانداو ئەم لاوازیو بێ هێزیشە ئەنجامی داڕزانی ڕەوشتی سیاسییەو سەرکردەش شۆڕشی دژی ئەو داڕزانە بەرپا کرد، بۆ چارەسازیش تەنیا تاکە ڕێگەیەك هەبوو ئەویش بوژانەوەی قەوارەی سیاسیانەی ئیسلام بوو لە سێبەری تاکە دەوڵەتێکی یەککگرتوودا، نەك بە سەرۆکایەتی خۆی بەڵکو بە سەرۆکایەتی شەرعی ئیسلامو بە سەرپەرشتی خەلافەتی عەبباسی [1].

+ **زۆر لە بەڵگەنامەکان کە ئاماژەیان کردووە بەزێدی ئەسڵی بنەماڵەی ئەیوبییەکان (دوین) بووە، هەندێکیشیان دەڵێن (دوین) لە ناوچە سنوورییەکانی (ئازەربایجان)ە، هەندێکی دیکەش دەڵێن (دوێن) ناوچەی هەولێر بووە کە ئێستا بووە بە (بتوێن)، ئایا کام ئاماژەیان لەسەرچاوە مێژووییەکاندا ڕاستە؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: ئێمە بەتەواوی ناتوانین ئەم ئاماژانە دیاری بکەین، بەلاّم گشت مێژوونووسە کۆنەکان ناوی نزیك هەولێریان نەهێناوە، هەر بۆیە ئەگەر ئاماژە بۆ هەولێر بکرایە ئەوا (ابن خلكان) خۆی کە خەڵکی هەولێرە دەبوو ئاماژەی بۆ ئەو دوێنی (بتوێن)ەی لای هەولێر بکردایەو بیوتایە ئەوەندە فەرسەخ لە هەولێر دوورە، وتراوە (كذا من أذربيجان)، (كذا من الران).

زۆربەی گەڕۆکەکانی سەدەی بیستەم لە (١٩٥٠ ـ ١٩٦٠) گەیشتوونەتە ئەو شوێنانەی کە دەڵێن کاتی خۆی ئەیوبییەکانی لێبووە دەڵێن (قد يكون هذا الموقع مسقط رأس الأيوبيين) ئەو شوێنەش کوێیە؟ ڕۆژئاوای هەولێرە، واتا (پیرمام)، لای هاوینەهەواری صەلاحەددین، بەلاّم (ياقوت الحموي، ابن الأثير، وابن خلكان) کەسیان ناوی هەولێریان نەهێناوە .

پێویستە ئەوە بڵێم کاتی خۆی مامۆستا عەبدولخالق سەرسام دوو کتێبی لەسەر صەلاحەددین نووسی بەناوی (صلاح الدين من جديد)و (صلاح الدين ليس من أرمنينيا)، لە کتێبی دووەمدا وەلاّمی مامۆستا (عەبدولڕەقیب یوسف)ی داوە کە وتوویەتی صەلاحەددین لە نزیك ئەرمینیا لە دایکبووەو کوردە، ئەویش وەلاّمی دەداتەوەو دەڵێ: نەخێر خەڵکی ئەرمینیا

---

[1] صەلاحەددینی ئەیوبیی، ژیاننامەی گەشترین، د. موحسین موحەممەد حسێن، و. عبدالرزاق بيمار، دار الحرية للطباعة، بغداد ـ چاپی یەکەم، ١٩٩٣.

نییەو لەوێ لەدایك نەبووە، واتا ئەرمەنی نییە، كە ئەمە بۆچوونێكی هەڵەیە، چونكە ئەگەر چی لە (یەریڤان)[١]یش لەدایكبووبێت لە ئەرمینیایە ئەوە مەرج نییە كە ئەرمەنی بێت، هەروەكو چۆن ئەگەر لە تكریت لەدایكبووبێتو بیستو چوار سەعات لەوێ بووبێت، ئەوا بەوە نابێتە عەرەب، بە هەمان شێوە لێرەشدا هەروایە، گەرچی (تكریت)یش كاتی فتوحاتی ئیسلامیی شارۆچكەیەكی عەرەبی نەبووە.

حەز دەكەم ئەوە بڵێم كە مێژوونووسانی كۆنو زۆر لەمێژوونووسانی ئەو سەردەمە بە ئینساف تربوونو درۆو دەلەسەیان نەبووە هەرچی ڕاست بووە نووسیویانە، نەك وەك ئەوانەی ئێستا كە مەسەلەی نەتەوە پەرستیو ناوچەگەریو خێڵایەتی وایان لێكردوون لە ئاست ڕاستییەكان چاو بنوقێننو دەست بكەن بە نووسینی شتی درۆو ناڕاستو حەقیقەتەكان بشارنەوە تەنها لەبەر ئەوەی هەندێك كەسو خەڵك لە خۆیان ڕازی بكەن، هەر بۆیە درۆ لەمێژوودا گوریسەكەی كورتەو زوو دەپچڕێت ناتوانی ڕاستییەكان وەلا بنێیت لە بەرامبەر حەقیقەتەكانی مێژوودا.

من سێ كتێبم نووسیوە لەسەر صەلاحەددین باسی ئەمانەم نەكردووە كە بڵێم صەلاحەددین خەڵكی ناوچەی هەولێرە، بەڵكو وتوومە سەرچاوە كۆنەكان دەڵێن خەڵكی (دوین)ی ناوچەی ئازەربایجان–ە، لە كتێبی (ژیاننامەی صەلاحەددینی ئەیوبی) دا وتوومە: مێژوونووسان لەسەر ئەوە ڕێككەوتوون كە باوكو كەسوكاری صەلاحەددین لە (دوێن)ەوە هاتوون كە شارێكە لە دوا ناوچە لە ناوچەكانی ئەزربێجان لەلای ئەڕرانە، ئەوانە ڕەوادین، ڕەوادیش تیرەیەكە لە هەزبانی، ئەمەش هۆزێكی گەورەی كوردە. (صەلاحەددینی ئەیوبیی، ژیاننامەی گەشترین، د. موحسین موحەممەد حسێن، و. عبدالرزاق بیمار، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٩٣).

**+ ئایا ئەو (دوین)ی ئازەربایجان كوردستان بووە؟**

ـ دكتۆر موحسین موحەممەد: با (دوین) كوردستان نەبێت، با لە قەوقازو یابان لە دایك بووبێت ئەو كە كورد بێت هەر كوردە، عەرەب بێت هەر عەرەبە، من منداڵەكانم لە بەغدا لە دایكبوون بەڵام ناڵێم ئەمانە بەغداینو عەرەبن، ئەویش هەروایە، ئەو ە مێژوونووسانیش وایان سەلماندووە.

**+ كامانەن ئەو مێژوونووسانە؟**

ـ دكتۆر موحسین موحەممەد: (ابن شداد، ابو شامة، ابن الأثير.. هتد)، جگە لەوانەش ژمارەیەكی تر لە مانەوە زانیارییان وەرگرتووە لە (ابن واصل، ابن كثير، المقريزى الجنسي، القلقشندي، النويري،.. تاد)، هەموو ئەمانە دەڵێن (صلاح الدين من اسرة كردية..).

**+ ئەم بنەماڵەیە كاتێ چوونەتە تكریت، ئەوەبوو لەسەر دەستی مامی صەلاحەددین ڕووداوێك ڕوویداو پیاوێكی كوشت، ئیدی فەرمانڕەوای ئەو دەڤەرە (موجاهدەدین بەهرۆز) فەرمانیدا نەجمەددین ئەیوب و شێركۆی برای شاری تكریت بەجێ بێڵن، لەم كاتەدا ڕوویان لە موصڵ كرد، باشە نەیاندەتوانی لە بریتی ئەوەی ڕووبكەنە موصڵ، جارێكی تر بێنەوە بۆ زێدی ڕەسەنی خۆیان كە كوردستان بووە؟**

ـ دكتۆر موحسین موحەممەد: بەڵێ دەیانتوانی، بەڵام ئەوەیان نەكرد، دەبێ لێیان بپرسین بۆ نەگەڕانەوە؟ من هۆكاری ئەمەت پێدەڵێم بۆ چی نەگەڕانەوە زێدی باپیرانی خۆیان كە كوردستان بوو، لەڕاستیدا ئەمانە لە هەوڵی بەرژەوەندی سیاسیی خۆیاندابوون، واتە دەیانویست پێگەی سیاسی خۆیان بەهێز بكەن، ئا لەو كاتەدا ئەگەر هاتباو ڕوویان لە كوردستان بكردایەتەوە ئەوا دەبوایە مێرنشینێكی دابمەزراندایە، ئەوانیش ڕازی نەدەبوون، ئەوان ئەگەر لە كوردستان میرنشینێكیان دابمەزراندایە نەیاندەتوانی لە هەموو دنیادا بەوشێوەیە ناوو ناوبانگ دەربكەن، كە لەڕۆژهەڵاتو لە ڕۆژئاوادا بناسرێن، چونكە

---

[١] یەریڤان: پایتەختی ئەرمینیایە.

ئەوکات دەگوترا (مؤسس الأمارة الفلانية) واتە (دامەزرێنەری میرنشینی فلان)، بەلاَم دوایی وترا (صلاح الدين قائد المسلمين في الشرق).

**+ چۆن دەیانزانی بەرژەوەندی سیاسییان دەست دەکەوێت؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: چۆن نەیاندەزانی، ئەگەر روویان لە کوردستان بکردایەتەوە ئەوا هیچیان نەکردووە، ئەوان سەرەتا چوونە بەغدا دەوریان بینی لە شەڕی سەلجوقییەکان دژی خەلیفەی بەغداد، دوایی هاتنە تکریتو لەوێوە چوونە موصڵ ئینجا چوونە حەڵەب، ئینجا چوونە دیمەشقن، لە هەریەك لەم شوێنانەدا رۆژ لەدوای رۆژ تواناو رۆڵیان دەردەکەوت لە پرۆسەی سیاسیدا، تاوەکو وردە وردە بەوە گەیشتن وەکو بنەماڵەیەکی دیاری کوردی ناسران لە رووی سیاسیی و سەربازییەوە.

دەبینی نەجمەدین ئەیوب راوێژکاری نورەدین مەحمود بوو، شێرکۆی برای سەرەکردەی سەربازی دەوڵەتی نورەدین مەحمود بوو، لێرەوە ناتوانین باس لەوە نەکەین کە بنەماڵەی ئەیوبییەکان بە دوای بەرژەوەندی سیاسیدا گەڕاون.

**+ ئایا مێژوونووسەکان ئەمانەیان روونکردۆتەوە؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: نەخێر مێژوونووسەکان باسیان لەمانە نەکردووە، بەلاَم چالاکیی و جموجووڵ و دەرکەوتنیان ئەوانە دەسەلمێنن، هەروەها لە پەیوەندییەکانیان لەو کاتانەدا لەگەڵ ئەتابەگیەکان[1] کە (نورەدین مەحمود)[2] هەبوو تورك بوون، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لە سەر ئەوەی کە نەتەوەگەرایی نەبووەتە پێوەر لەو کاتانەدا، بەڵکو یەکڕیزی مسوڵمانان و وەستان دژی یەك دوژمن، دەتوانین بڵێین هەستی نەتەوەیی هەبووە بەلاَم نەك بەو شێوەیە کە ئێستا بیری لێدەکەینەوە کە ناوی بزووتنەوەی نەتەوایەتی بێت، ئەوە هەرگیز نەبووە، پێویستە ئەوەش روون کەمەوە کە هەندێك لە پاشماوەی دەوڵەتی ئەیوبییەکان ویستیان دەوڵەتێك دابمەزرێنن، بەلاَم کاتێ عەبباسییەکان پێیان زانین هەموویان گرتن و لە سێدارەیاندان.

**+ ویستیان ئەو دەوڵەتە لەکوێ دامەزرێنن؟ لە کوردستان؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: لەوانەیە لە کوردستان بووبێت، یان لەوانەبوو دەوڵەتێك دابمەزرێنن و کودەتایەك لە دەوڵەتی عەبباسی بکەن، واتە دەوڵەتی عەبباسی لابدەن و خۆیان دەسەلاَت بگرنە دەست.

**+ ئەوانە پاشماوەی ئەیوبییەکان بوون و لە کوردستان بەجێمابوون؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: نەخێر، نەوەی دووەم و سێیەمی ئەیوبییەکان کە لەولاَتی شام بوون، یان هەر ئەو نەوەیەبوون لە کوردستان بوون.



**+ هیچ هەیە لەبەردەستدا دەربارەی ئەوەی کە بنەماڵەی ئەیوبییەکان بەزمانی کوردیی قسەیان کردبێ و پێوەی پابەند بووبن؟**

[1] ئەتابەگییەکان: (ئەتابەگ) وشەیەکی تورکییە لە دوو برگە پێکهاتووە (ئەتا = باوك)، (بەگ = میر)، بە واتای باوکی میر دێت، لەبنەڕەتدا بەو کەسە دەگوتریا کە پەروەردەکردنی منداڵی سوڵتانەکانی دەکەوێتە ئەستۆی، پاشان میری دەوڵەتەکانو فەرمانڕەواکانی کوردستان ئەم نازناوەیان هەڵگرتووە کە بریتیبوون لە پێنج چین: میرەکانی فەرمانڕەوای ئەرتەقی، فەرمانڕەواکانی شای ئەرمەنە سوڵتانەکانی فەرمانڕەوایی زەنکی، ئەتابەگییەکانی ئازەربایجان و ئەتابەگی لوڕستان و هەولێر.

صەلاحەددین بدوێنین یان خۆمان بە بەرپرسیار بزانین، دیالۆگی بەدران ئەحمەد، لەگەڵ د. موحسین موحەممەد، و. ئاواز جاف، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم ـ سلێمانی، ٢٠٠٥.

[2] نورەدین مەحمود (٥٥٩ك ـ ١١٦٤ز) کوڕی عیمادەدین زەنکی بوو لە شام فەرمانڕەوابوو، کارو باری سەرکردایەتیو رێکخستنی هەڵمەتی شەڕکردنی بە (شێرکۆ)ی مامی صەلاحەددین سپارد بۆ پاراستنی ولاَت لە دەستی خاچپەرستەکان.

ـ دکتۆر موحەممەد موحسین: ڕیوایەتێك هەیە کە صەلاحەددین لەگەڵ (عماد الدين الكاتب الأصفهاني) کە فارس بووەو یەکێك لە مێژوو نووسە گەورەکانی سەردەمی صەلاحەددین بووەو لە دیوانەکەیدا مێژووەکەی نووسیوەتەوە لەگەڵ (قاضي الفاضل)ی یەکێك لە مێژوو نووسەکان دەڵێ (وانفرد مع عمادالدين الكاتب وتحدث باللغة الأعجمية) کەواتە یان عماد الدین لەگەڵ صەلاحەددین فێری کوردی بووە، وەیاخود صەلاحەددین لەگەڵ عماد الدین فێری فارسی بووە، بەڵام یەکەم بۆچوونیان پەسەند دەکەم، چونکە عماد الدین لەگەڵ سوپای صەلاحەددین بووە زۆربەی ئەوانەی لەگەڵیدابوون کورد بوون، لەبەر ئەوە ئەو کوردییە کە فێربووەو قسەی پێکردووە، چونکە ئەگەر فارسی بزانێت ئەوا کوردی بە ئاسانی فێردەبێت و پێچەوانەشی هەر ڕاستە.

ڕیوایەتێکی تر هەیە کە گوایە نوورەدین مەحمود ویستوویەتی بچێتە میسر کە ئەوکاتە صەلاحەددین لەوی دەبێت بۆ ئەوەی میسر لە دەستی صەلاحەددین وەربگرێت، ئەوەبوو ناوبراو ناڕەزایی دەردەبڕێت لەوەی کە نورەدین بچێتە میسر، دواتر برازاکەی صەلاحەددین بەناوی (تقي الدين عمر) توڕە دەبێت، دوایی صەلاحەددین بە برازاکەی دەڵێت: تۆ چۆن تووڕە دەبیت و ئەو قسە دەکەی ئەم کۆڕو کۆبوونەوەیە پڕە لە پیاوانی نورەدین مەحمودەو ئەگەر ئەم قسانەی تۆی پێ بگات سوپایەك دەنێرێت و هەموومان لە میسر دەردەکات، ئینجا دوایی صەلاحەددین لەگەڵ باوکی پێکەوە قسەیان کرد دەڵێ (وتحدث معه بااللغة العجمية)، بەڵگە چییە کە لێرەدا بەزمانی عەجەمی قسەیان کردووە؟ (جورجي زيدان) لە کتێبەکەی بەناوی (صلاح الدين ومكائد الحشاشين)و کتێبەکەی تری (صلاح الدين و ريكار دوس قلب الأسد) باس دەکات دەڵێ: (صلاح الدين كان يتحدث مع أطرافه باللغة الكردية)، صەلاحەددین کوردستانی نەبینیوە تێیدا بژی، بەڵکو هەموو گەنجێتییەکەی لە بەعلەبەگو دیمەشق بووە، دوایی چووەتە میسرو هاتووەتە کوردستان، بەڵام لەگەڵ سوپاکەیدا بۆ شاری دیاربەکرو ماردین، چووەتە موصلّ بۆ گەمارۆدان لە کاتی جەنگدا، ئیدی زمانی ئەو کاتەش وەکو زمانی ڕەسمی دەوڵەت تەنها عەرەبی بووە، ئەگەر سەربازە چەکدارەکان خۆیان بە کوردی یان تورکی یان فارسی قسەیان کردبێت ئەوەیان شتێکی ترە.

**+ زۆرێك لە نووسراوەکانی تۆم خوێندووەتەوە کە لەسەر صەلاحەددین نووسیوتە، دەبینم وەکو پارێزەرو داکۆکیکارێکی توند زۆر بەرگری لەم سەرکردە کوردییە دەکەیت، ئەم پێداگرییەی جەنابت بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

ـ دکتۆر موحەممەد موحسین: سەرەتا ئەوەت پێ بڵێم باوەڕناکەم تاوەکو ئێستا شتم نووسیبێ کە بەبێ لایەنی نەبووبێت، هەتاوەکو بەر لەوەی من لەسەر صەلاحەددین بنووسم لەسەر شاری هەولێر لە سەردەمی ئەتابەگییەکان نووسیومەو زۆر تەقدیری (سوڵتان موزەفەرەدین)[١]م کردووە کە فەرمانڕەوای هەولێر بووە لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنەم لێگرتووە، من باسێکم نووسی کاتی خۆی لە گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی کوەیت بڵاوبوویەوە ئەوەبوو ڕەخنەم لە صەلاحەددین گرت، هەروەها ڕەخنەشم لە (ابن الأثير) گرت کە ئەویش ڕەخنەی لە صەلاحەددین گرتبوو.

بەڵام سەرکردەیەکی بەوشێوەیە هیچ کەس ناتوانێ بۆ سەردەمی خۆی ڕێزی لێ نەگرێت هەتاوەکو مێژوونووسە ئەورووپییەکان و ڕۆژهەڵاتناسەکانیش ناتوانن ڕاستیو بایەخی گرنگی ئەو سەرکردەیە نەنرخێنن، لەبەر ئەوە من ئەگەر کوردیش نەبوومایە هەر بەو شێوەیە لەسەر صەلاحەددین دەمنووسی، نەك لەبەر ئەوەی کە کوردە، بەڵکو لەبەر ئەوەی سەرکردەیەکی گەورەو لێوەشاوەیە، ئینجا ئەو سەرکردەیە بیست و دوو ساڵ لە مەیدانی جیهاددا بووە هەر دەبێت هەڵەشی بووبێ، بێگومان بێ هەڵە نەبووە، بەڵام هەڵەکانی شتی بچووك بوون، وانەبوون کە گەورە سەیر بکرێن.

دەتوانم بڵێم من جگە لەوەی کە لەبەر ئەوە ئەم سەرکردەیە گرنگ و لێهاتووبووە، لەلایەکی تریش وەکو کوردێك بە ئەرکی سەرشانمی خۆمم زانیوە مێژووی ژیانی بنووسمەوە.

---

[١] سوڵتان موزەفەرەدین زاوای صەلاحەددین ئەیوبی بووەو هەر لەو کاتەشدا فەرمانڕەوایی شاری هەولێری کردووە.

**+ ئەو ماوە زۆرەی لە بەغدا بووی لەسەر ئەم قەزیەیە لە ناو عەرەبەکانیشدا بەم شێوەیە دەدوای؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: من لە بەغدا چەندین سیمینارم کردووە لە دەزگاکانی ڕۆشنبیری و یانەکان لە بەغداو ئەستامبول و دیاربەکرو شارەکانی لیبیاو تونس و لە زانکۆو کۆلێژەکانی خۆمان هەرگیز لەمانە لام نەدەدا، زۆر جار یەحەیان دەگرتم، لەسەر ئەو شتانەی کە لەسەر صەلاحەددین دەمووت، بەڵام سەرکەوتوو بووم، چونکە بە بەڵگەوە هەرچیم بووتایە دەمسەلماند بۆیان، لەبەر ئەوە لەخۆمەوە هیچم نەدەوت، دوایی کە سیمینارەکە تەواو دەبوو ئەو برادەرانەی کە قسەکانیان دەکرد دەیانگوت قسەکانت ڕاستە .

**+ زیاتر بەعسییەکان بوون؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: ناتوانم بڵێم بەعسییەکان بوون، بەڵکو هەموو عەرەبە قەومییەکان غەیری ئەوانیش بوون، ئینجا بەعسییەکان نەدەهاتنە سیمینارەکان، چونکە خۆیان لەوە بەگەورەتر دەگرت کە بێنە سیمینارەوە دابنیشن، ئەگەرچی هەموو ئەوانە دەهات، کە حەزیان لە حەقیقەت و زانینی مێژووی ڕاست دەبوو.

**+ دەڵێن ناوت هەبووە بۆ سیمینارێك لە تکریت، بەڵام دوایی ناوەکەت لابراوە، ئەمە چۆن بوو؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: من لە و زنجیرە کۆڕەدا یەکەم ناوبووم لە تکریت، لەڕیزی ئەو مامۆستایانەدا کە بڕیاربوو کۆڕبگرین لە تکریت بەناوی (مدینة البطلین) واتا (صەلاحەددین و صەددام) باوڕەت هەبێ لەوێ دەستم لەسەر دڵم بوو، دەموت باشە من لەوێ چی بڵێم؟ ناتوانم لە حەقیقەت لابدەم، هێشتا دوو هەفتەی مابوو بۆ کۆڕەکە ڕۆژێك ڕاگری کۆلێژەکەمان هات وتی: دکتۆر تۆ بەشداری دەکەیت لە کۆڕەکانی تکریت؟ منیش وتم: بەڵێ بەپێکەنینەوە وتی: باشە ، ئەو ناوی (عبدالرحمن نجم العاني) بوو، بەعسییەکی تۆخ بوو، من نەمزانی بۆچی پێدەکەنێت؟، ئیدی دواتر چوو بۆ لای (لطیف نصیف جاسم) کە وەزیری ڕۆشنبیری بوو، وتبووی لیستی ناوەکانم بدەرێ ئەوانەی کە کۆڕەکە دەگرن، کە دابوویە بە وەزیری وتبوو ئەو ناوە بسڕنەوە (دکتۆر موحسین) وەزیریش وتبووی بۆچی؟ ڕاگرەکەمان وتبووی ئەوە کوردە هەرچی خۆی دەیەوێت ئەوە دەڵێت، دوایش (دکتۆر عماد عبدالسلام رؤوف) کە مامۆستای مێژووبوو هات بەنهێنیی پێی وتم کە ناوەکەتیان سڕیوەتەوە.

**+ بەم شێوەیە باسی عەرەبەکان دەکەیت، دەبینی کوردەکانیش بۆچوونی نێگەتیڤیان هەیە بەرامبەر صەلاحەددین، ئەم دوو بۆچوونە چۆن لێك دەدەیتەوە؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: هەردوو بۆچوونەکە هەڵەیە، کوردەکانیش وەکو عەرەبەکان هەڵەن، ڕاستە کوردەکان دەڵێن لەبەر ئەوەی چونکە دەوڵەتێکی کوردی دروستنەکردووە، بەڵام زۆر لەگەڵ ئێستادا جیاوازی هەیەو ململانێکان لەو کاتەدا ململانێی ئایینی بووە، نەك نەتەوەپەرستی، ململانێی ئیسلام و خاچدروشمەکان بووە نەك کوردو نەتەوەیەکی تر. بەهۆی شەڕی خاچ دروشمەکانەوە کورد پەیوەندی بە صەلاحەددینەوە کرد، نەك بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی، بە هۆی زاڵبوونی هەستی ئاینی بەسەر هەستی نەتەوایەتی، هەرچەندە پەیوەست بوونە بە نەتەوە.

**+ سەرەتای جەنگی خاچ پەرستی لەکوێوە دەستی پێکرد؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: زۆرکەس ئەوە نازانێت کە سەرەتای جەنگی خاچ دروشمەکان لە کوردستانەوە دەستی پێکردووە، نەك لە فەلەستین، نەك لە شام، گشت گێڕانەوە مێژووییەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە دە هەزار سوارەی کوردی لە شاری (مەلازگرد)[1] ی باکووری کوردستان بەشدارییان کرد لە شەڕی دژی دەوڵەتی ڕۆمی بێزەنتی کە ئەوکات

---

[1] مەلازگرد: شارێکی کوردییە لە کوردستانی باکوور (تورکیا).

سوڵتانی سەلجوقی (ئەلب ارسلان)[1] هەبوو کوردەکان لەگەڵ ئەواندا بوون، ئەوەبوو ساڵی (١٠٧١ز)، سەرکردەکەیانی دەستگیرکرد، کە ناوی (ڕۆمانۆس)[2] بوون، ئیدی ڕۆمەکان پەنایان بردە بەر مەسیحییە کاسۆلیکەکـانی ڕۆژئاواو وتیان فریامان کەون ئیـسلامە کوردو تورکەکان تەماشا بکەن چیمان لێدەکەن! ، ئـەمان لەسەر مەزهەبی ئەرسەدۆکسی (ارثذوکس)[3] بوون، ڕۆژئاواش (کاثولیك)[4] بوون، وتیان فەرموون ئێمە خاوەنی یەك ئایینین، بەڵام ناکۆکی مەزهەبیمان هەیە، ئەوا ئیسلامییەکان بەهەموو نەتەوەکانەوە دژی ئێمە وەستاون و هەموو هێزەکانی خۆیان کۆکردەوە نەمانتوانی کوردو تورکەکان تێك بشکێنین.

بەردەوام نامەو ڕاپۆرت بۆ پاپا دەچوو لە کەنیسەو مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵاتەوە کە داوای یەکبوون و یەکڕیزی مەسیحییەکانیان دەکرد بەبێ جیاوازی لایەنداری مەزهەبی، پاپا لە شاری (کلیرمۆنت)[5]ی فەرەنسا بوو، لەپاش بیستو چوار ساڵ لەم شەڕانە کاتێ بینی لە ئەندەلوس کە لە ژێردەستی مسوڵمانەکاندا بوو (طليطلە توليدو) و هەروەها دورگەی (صقلية) دەرهێنران و کەوتنەوە دەستی مەسیحییەکان، پاپا بیری لەوە کردەوە کە بزووتنەوەیەك دروست بکات بەناوی حەجکردن بۆ (قودس، و ناصیرە، وبیت لحم) کە چۆن ئەم خاکانە لە ژێر دەستی موسڵمانە بێباوەڕەکان دەربهێنرێت وتی: "هكذا اراد الله، هذه هي مشيئة الله فلنذهب لتحرير الأرض المقدسة من الكفار المسلمين"، دواتر هاتن و لەبەر ئەوەی پاپا فەرەنسی بوو لە فەرەنسا فەرمانی پێدابوون شەڕەکەیان ناونا (حروب الفرنجة)، کە هاتن وایان دەزانی هەموو ئیسلامییەکان سەلجوقین و تورکن دوایی ئیسلامییەکانیان ناو نا (سراسینو)[6] و مانای زۆرە واتا (ڕۆژهەڵاتی، عەرەب، ئیسلامییەکان..) یان (نەوەی ساراش دەگرێتەوە کە خێزانی حەزرەتی ئیبراهیم بوو)، ئینجا خاچدروشمەکان لەکاتی هاتنیاندا ئەو شەڕو بوێرییەی (سراسینو)کان کە دیتبوویان سەرنجی هەموویان ڕاکێشابوو دەیانگوت: خۆزگە ئەمانەش لەگەڵ خۆمان بوونایە، واتا کافر نەبوونایە مەسیحی بوونایە، دەمانتوانی هەموویان داگیر بکەین.

پاشان هێرشی فەرەنجەکان کە هاتە سەر خاکی کوردستان، کوردەکان بەرگرییان کردو ڕووبەڕووی هێرشی ئەو خاچ دروشمانە وەستانەوە، پێویستە ئاماژە بەوەش بکەم یەکەمین میرنشینی خاچ دروشمەکان کە دروست بوو لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا لەسەر خاکی کوردستان دروست بوو لە شاری (ئورفە)ی کوردستانی باکور (تورکیا) کە ئەو کاتە پێیان دەوت (مدينة الروحا)[7] و مەسیحییەکان پێیان دەوت (ادیسا)، دەبینین کوردەکان بەرگرییەکی بی وێنەیان کرد بەرامبەر خاچ دروشمەکان ئەوەتا (ئوسامە بن منقد) لە کتێبەکەی (الأعتبار) کە ماوەیەك پێش صەلاحەددین نووسیویەتی باس لە ئازایەتی کوردەکان دەکات کە چۆن بەرگرییەکی بێ وچان لە نیشتیمانی خۆیان کردووە لە کاتێکدا ئەم نووسەرە لە دوولاوە لە




[1] ئەلب ارسلان: بەناوبانگترین سوڵتانی سەلجوقییەکان بوو، بەهۆی ئەو جەنگە زۆرانەوی کە لەگەڵ دوژمنەکانی دەوروبەریان دەیکرد ناوبانگی دەرکرد.

[2] ڕۆمانۆس: سەرکردەی ڕۆمە بێزەنتینییەکان بوو لە کوردستانی باکوور (تورکیا)، لە ساڵی (١٠٧١ز) بەدەست تورکە سەلجوقییەکان کوژرا.

[3] ئەرسەدۆکسی: مەزهەبی مەسیحییەکانە کە لەڕۆژهەڵاتدا بوون، مەسیحییەکان چەند مەزهەبێکیان هەیە بە ڕۆژئاواییەکان وتراوە ئەرسەدۆکسی.

[4] کاتۆلیك: مەزهەبی ڕەسەنی مەسیحییەکانی ڕۆژئاواو ئەوروپان، لە بەرامبەر ئەمانەدا پرۆتستانتەکانیش هەیە کە مەزهەبێکی ترن.

[5] کلیرمۆنت: ئەو شارەبوو لە فەرەنسا کە پاپای مەرجەعی مەسیحییەکان لەوێ دادەنیشتو هەموو گەڕانەوەو ڕاوێژێکیان بۆ لای ئەوبوو.

[6] ئەم وشەیە واتایەکی گشتگیربوو بە تێکڕا بۆ بیروبۆچوون و ناوی ئەو نەتەوانە بەکاردەهات کە بەجارێك دژی ڕەوتی خاچییەکان وەستان لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا.

[7] میرنشینی (روها)یشی پێوتراوە، خاچدروشمەکان لەو ماوەیەی کە لە ڕۆژهەڵاتدا بوون سێ میرنشینیان دروستکردووە، ئەمە یەکەم میرنشینیانە کە لە خاکی کوردستان و ناوچەی جەزیرەی سەرەوە بووە.

تورکەکانو مسوڵمانەکان جیاوازبوو، یەکیان ئەوەبوو ئوسامە عەرەب بوو، یەکیدییان پێوەندی بەهێزی لەگەڵ خاچ دروشمەکاندا هەبوو تاوەکو مسوڵمانەکان.

+ صەلاحەددین چۆن لە دیمەشقەوە چوو بۆ میسر؟

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: صەلاحەددین لەگەڵ شێرکۆی مامی ساڵی (٥٥٩)ك، چووە میسر وەکو یەکێك لە ئەفسەرەکانی نورەدین مەحمود، ئەوەبوو نارەزایی دەربڕی بچێت بۆ میسر، وتی: من باوکم حاکمی دیمەشقەو لەگەڵ ئەودا دەمێنمەوە، ئیدی مامی ڕێگای نەدا، پێی وت (تهيأ يا يوسف)، وتی: هەردەبێ لەگەڵم بێی بۆ میسر بۆ شەڕکردن، چونکە خاچ دروشمەکان دەیانەوێ میسر داگیر بکەن، میسر فاتمییەکانی تێدابوو، بەرگری لە وڵاتی خۆیان بکەن لەگەڵ خاچ دروشمەکان لەبەر ئەوەی لاوازبوون، لەوکاتەدا کە ئەمان چوونە میسر لە دەوڵەتی فاتمیدا ناکۆکی هەبوو لەسەر پلەو پایەی وەزیری لەنێوان (ضرغام)[1] و (شاور)[2]، چونکە (شاور) خۆی وەزیر بوو لەگەڵ (ضرغام)دا ململانێی دەسەڵاتیان دەکرد، ئالەم کاتانەدا کە صەلاحەددین لەگەڵ شێرکۆی مامی بە چوار هەزار سەربازەوە ڕوویان لە میسر کرد، خاچییەکان هەواڵیان بۆ ناردو وتیان: شێرکۆ تۆ بگەڕێوە بۆ دواوە ئێمەش لە خاکی میسر دەگەڕێینەوەو وازدەهێنین. ئەوەبوو کشایەوە، لە پاش سێ ساڵی تر دیسان خەلیفە (العاضد)[3]ی خەلیفەی فاتمی داوای هێزی سەربازی لێکردنەوە هاتنو جارێکی دی کشانەوە، پاشان بۆ جاری سێیەم خەلیفە (العاضد) داوایکردەوە لە نورەدین مەحمود کە هێزبنێرێت بۆ میسرو تکای لێکرد وتی: یانورەدین مەحمود ئیسلام لە مەترسیدایە، ئەوەبوو وەکو نەریتێکی ئەوکاتە پرچی ئافرەتانی کۆشکەکەی کە لە دەوریدابوون بڕیو ناردی وتی: "بۆ خاتری ئەو پرچانە ئەمجارە کە هێزتان بۆ ناردین مەیگەڕێننەوە بۆ دواوە، چونکە هێزی داگیرکەری خاچی زۆری بۆ هێناوینو وا خەریکە میسر داگیر دەکەن، پێویست ناکات ئێمە ناکۆکیمان هەبێت، چونکە ئەگەر ئەوان بێن بۆ میسر هەموو خاکی مسوڵمانان داگیر دەکەن"، لێرەدا نورەدین فەرمانیدا بەشێرکۆو وتی: هێزێکی زۆر لەگەڵ خۆت ببەو ئیدی جارێ لە میسر بمێننەوەو ئەوێ چۆڵ مەکەن، شێرکۆ دیسان داوای لە صەلاحەددین کرد پێکەوە بچنەوە بۆ میسر، صەلاحەددین وتی: باشە مامە ئەوە چییە چەند ساڵ جارێك دەچین بۆ میسرو دواتر دەکشینەوە، وتی: لەگەڵت نایەم بۆ میسر، ئالێرەدا (ابن الأثير) کە بە تاقە مێژوونووسێك ناسراوە کە دژایەتی صەلاحەددینی کردووە دەڵێت: صەلاحەددین نەدەچوو بۆ میسر نەیدەزانی دواڕۆژەکەی بۆ ئەو دەبێت، واتا ئەگەر بیزانیبا دەبێتە خاوەن دەسەلات بە پەرۆشەوە دەچووە میسر.

لەدواییدا شێرکۆو صەلاحەددین بەهێزێکی سەربازییەوە چوونەوە بۆ میسر، خاچ دروشمەکان لەوێ کشانەوە، صەلاحەددین کە ئەو کاتە لاو بوو، وتی: هۆکاری ئەوەی کە دەوڵەتی فاتمی ناوبەناو هانامان بۆ دێنن لەوانەیە ئەوەبێت کە ئەم دوو کەسە ململانێ دەکەن، (شاور) ئێستا وەزیرە لەوانەیە خیانەتمان لێ بکات، لەبەر ئەوە پێویستە بکوژرێت، ئیدی ڕۆژێك لە مزگەوتی ئیمامی شافعی دەرچوو لە قاهیرەو صەلاحەددین بەدوایدا دەچێتو دەیکوژێت، دوایی خۆی دەبێتە وەزیر، چونکە ئەو کاتانە واباوبوو هەرکەس وەزیرێك بکوژێت ئەوا دوایی خۆی پۆستەکەی دەگرێتە دەست، بەلام خەلیفەی فاتمی بە صەلاحەددینی وت: تۆ جارێ گەنجیت دەبێ مامت وەزیر بێت، لەوێدا مامی کرایە وەزیرو خەلیفەی فاتمی ناوی نا (الملك المنصور أسدالدين شيركو) واتا شێری شێران، هەروەها صەلاحەددینیش هەر ئەو خەلیفەیە ناوی نا (صلاح الدين

---

[1] (زرغام ـ ضرغام): دووا وەزیری فاتمییەکان بوو پێش وەزیری "شاور" کە بە دەستی صەلاحەددین کوژرا.

[2] شاور: وەزیری دەوڵەتی فاتمییەکان بوو، ویستی خیانەت لەو دەوڵەتە بکاتو لەگەڵ خاچییەکان دەست تێکەڵ بکات، ئەوەبوو صەلاحەددین بەمەی زانیو کوشتی، پاشان وەکو نەریتێکی ئەو کاتە کە هەرکەس وەزیرێکی بکوشتایە دەچووە جێگاکەی، ئیدی دوای ئەو خۆی بووە وەزیر لە دەوڵەتی فاتمیدا.

[3] یەکێك بوو لە خەلیفەی فاتمییەکان لە میسر کە لە پاش مردنی براکەی کە پێشتر خەلیفە بوو جڵەوی دەسەلاتی گرتە دەستو هەر ئەمیش پێشوازی لە بوون بە وەزیری لە صەلاحەددین کرد، دواتر نازناوی (صەلاحەددین)ی پێبەخشی.

والدنیا یوسف)، بەلاّم شێرکۆ پاش چەند مانگێك وەفاتی کردو خەلیفەی دەولّەتی فاتمی بەیەکجاری صەلاحەددینی کردە وەزیری دەولّەت.

**+ سەرکردەی گەورەترو وشیاوتر نەبوو لە بریتی صەلاحەددین دابنرێ، لە کاتێکدا صەلاحەددین لە تەمەندا گەنج بوو؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: لێرەدا (ابن الأثیر) ڕیوایەتێکی هەیە، هەرچەندە مەبەستی شکاندنی صەلاحەددینە، بەلاّم من دەلّێم هەزار ڕەحمەتی لێ بێت، دەلّێ: "هەموو سەرکردەکان لە صەلاحەددین گەورەتربوون وتیان چۆن دەبێت خەلیفەی فاتنمی وابکات لە کاتێکدا ئێمە هەموومان لە پێشترین لە صەلاحەددین بۆ وەزیری، کەچی ئەو دەچێت صەلاحەددینێکی گەنج دادەنێت"، ئەوانەش بریتیبوون لە (بدرالدین الیاروقیو عزالدین جۆردیك)و چەند کەسێکی تر، ئیدی کشانەوەو چوونەوە بۆ شام بۆ لای نورالدین مەحمود، ئەویش پێی وتن ئەوە بۆ هاتوونەتەوە، بۆچی دەولّەتی میسرتان بەجێهێشتووە؟ وتیان ئەسەدەدین شێرکۆ مردووەو خەلیفەی فاتمیش صەلاحەددینی کردۆتە وەزیر، ئایا صەلاحەددین پیاوی ئەوەیە بێتە وەزیر؟ نورەدین لە وەلاّمی ئەماندا وتی: "گرنگ نییە صەلاحەددین بێت یاخود یەکێکی تر، گرنگ ئەوەیە پارێزگاری لە میسر بکرێت، ئێستا کاتی ئەوە نییە ئێوە کێشە لەسەر پلەو پایەی وەزیری دروست بکەن، بەلّکو ئێمە ئەرکێکی گەورەترمان لەئەستۆیە ئەویش ئەویە کە داگیرکەرانو خاچ دروشمەکان نەچنە میسرەوە"، (حمایة مصر أهم من أي شئ آخر ـ أهم من الوزارة).

لە پاش ئەمانە خاچ دروشمەکان بیریان لەوە کردەوە کە شێرکۆ مردووەو صەلاحەددین شوێنی گرتۆتەوە، وتیان صەلاحەدینێکی مێرد منداڵ چییە پۆستی وەزارەتی گرتۆتە دەست، با دەرفەت بخوازینو بچین چەند شارو شارۆچکەیەکی میسرەوە داگیر بکەین، ئەوەبوو صەلاحەددین بەمەی زانیو داوای یارمەتی سەربازی لە خەلیفەی فاتمی کرد، خەلیفەش بە هەموو شێوەیەك یارمەتیدا تاوەکو صەلاحەددین توانی بە هەموو هێزێکی سەربازی ڕووبەڕووی خاچییەکان بێتەوە، ئالێرەوە صەلاحەددین توانای سەربازی بەدەرکەوتو ئازایەتی بۆ گشت لایەك ڕوونبووەوە، هەروەها پێشتریش لە جەنگی ئەسکەندەریەدا کاتی مامیشی نەبووبووە وەزیر، صەلاحەدین بەتەنیا توانی لە ئەسکەندەریە خاچ دروشمەکان بشکێنێو سەرکەوێت بەسەریاندا دوایی مامەکەی وتی: "ئافەرین صەلاحەددین تۆ توانای وات هەیە؟"، یانی لەو کاتەوە ئیسپاتی کرد کە عەقلّێکی سەربازی بەهێزی هەیە.

**+ شیعەبوونی دەولّەتی فاتمی هیچ ڕێگرییەکی دروست نەکرد لەبەردەم بوون بەوەزیری صەلاحەددین-دا؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: بەلّێ، دەولّەتی فاتمی دەولّەتێکی شیعی بوو، بەلاّم ئەو شیعەیە نەبوون کە لە ئێرانو عێراقو پاکستانو لوبنانو بەحرەینو شوێنەکانی تری دنیا هەیە، بەلّکو ئەمانە شیعەی ئیسماعیلی بوون[1] و میسریان وەرگرت دەولّەتێکیان دامەزراند لە مەغریب، لە تونس، توانییان لە میسردا دوو سەد سال حوکم بکەن، ئێستاش شوێنەوارەکانی شارستانێتییان هەر لەوێدا ماوە، خۆیان قاهیرەیان دروست کرد، ئەوان مزگەوتی ئەزهەریان دروستکرد کە دوایی بووە زانکۆیەکی جیهانیی بە ناوی (زانکۆی ئەزهەر)، کۆنترین زانکۆیە لە جیهان.

لەبەر ئەوە ئەوان ئەگەر بەدەمارگیرێتیی شیعەیی حوکمڕانییان بکردایە ئەوا هەرگیز نەیاندەتوانی ئەوماوە زۆرە فەرمانڕەوایەتی بگرنە دەست، میسرییەکانیش کاتێ شانازی بەمێژووی خۆیانەوە دەکەن باس لەو دووسەد سالّە دەکەن کە فاتمییەکان حوکمی میسریان کردووە، هەتا ناوی قاهیرە لە (قاهرة المعز)ەوە هاتووە کە یەکەمین خەلیفەی فاتمی بووە لە میسردا، فاتمییەکانیش بەو ناوەوە ناسراون، چونکە لە نەوەی فاتیمەی کچی پێغەمبەرن ﷺ.

کەواتە فاتمییەکانیش لایەنی مەزهەبگەرایی و شیعە و سوننەیان لێك نەدەدایەوە بۆیە توانییان سەرکەوتن بەدەست بهێنن.

[1] شیعەی ئیسماعیلییە: یەکێك لە گروپەکانی ناو شیعەن کە بڕوایان بە ئیمامێتی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری صادق هەبووە، (٢٩٧ك ـ ٥٦٧ن).

**+ تۆ پێشتر وتت زۆربەی وەزیرەکانی دەوڵەتی عەباسی فارس بوون (کەواتە شیعەبوون) هەروەها دەوڵەتی فاتمیش شیعە بوو، پێوەندیان چۆن بوو؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: وەزیرە فارسەکان دەوڵەتی عەبباس شیعە نەبوون، هیچ یەکیان‌و پەیوەندی دەوڵەتی بەغداد لەگەڵ دەوڵەتی فاتمیدا زۆر خراپ بوو، دەوڵەتی عەباسی‌و دەوڵەتی فاتمی دوژمنی یەکتر بوون، ململانێکانیشیان تەنها لەسەر دەسەڵات گرتنە دەست بوو! لەسەر هیچ شتێکی تر نەبوو! جا زۆرجار دێن لەسەر هۆکاری ئایینی و مەزهەبی دەڕۆن، ئەمە وانییە! تەنها داپۆشینەو هیچی تر، بەڵکو ململانێکە تەنها لەسەر کورسی دەسەڵات بوو، لە هەمان کاتدا عەباسییەکان سوننەش بوون، زۆر دژایەتی شیعەکانیان دەکرد، زۆربەی ئیمامە شیعەکان بەدەستی عەباسییەکان کوژراون.

دەتوانم ئەوە بڵێم دەوڵەتی فاتمی دەوڵەتێکی کراوەو موتەسامیح بووە، هەرگیز گوێیان بە هەندێ خیلاف ئاینی نەداوە، شتێکت پێ بڵێم تاڕاددەیەك گەیشتووەتە ئەوە کە یەکێك لە وەزیرەکانی دەوڵەت بەناوی (مماتی) مەسیحی بووە، وە وەزیرێکی تریان بەناوی (یعقوب بن کلس) جوولەکە بووە کە گەورەترین وەزیری فاتمی بووە دوایی بووەتە ئیسلام.

ئینجا بایەخێکی گەورەیاندا بەفراوانکردنی فیکرو بوارە جیاوازەکانی فەلسەفە لە سەردەمی ئەماندا زانایانی (منطق، فەلسەفە، علم الکلام، واتە ئیولۆژی) زۆربوون‌و گەشەیانکرد، صەلاحەددین کە وەزیر بوو لەم دەوڵەتەدا هەستا ئەم زانستانەی قەدەغە کرد وتی: ئەمانە لەگەڵ ئیسلامەتی ناگونجێت، هەتا وای لێهات سەردەمێك فەلسەفەو بیرکارییان والێکرد وتیان (من العلوم المهجورة وعلی المسلم أن یتجنبها) دەبێ مسوڵمان لێیان دوورکەوێتەوە، (لأن من یتعاطی هذه العلوم یصبح عقله کبیرا وایمانه ضعیفا) صەلاحەددین کە سوننە بوو هەستا گۆڕی ئیمامی شافیعی ئاوەدانکردەوەو گومەزێکی زۆر گەورەی لەسەر دروستکرد کە جێگای سەر سوڕمان بوو.

صەلاحەددین پێشتر کە سایەتییەکی زۆر ئایینی نەبوو واتە ئیلیزامی زۆر بەدینەوە نەبوو، بەڵام دوایی بووە سەرکردەی سەربازەکانی ئیسلامەکان لە جەنگی خاچ دروشمەکاندا، بووە سەرکردەی موجاهیدەکان ئیتر مەسەلەی ئایینی لەژیانی ڕەنگیدایەوەو زۆر پابەندبوو بە دینەوە تاوەکو وای لێهات وەکو سەرکردەیەکی دیاری مسوڵمانان ناسرا لە هەموو دنیادا، ئیبن شەدداد دەڵێ: "کان صلاح الدین لایرتاح الا بالأحادیث النبویة" زۆر حەزی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکرد، دەڵێ من کتێبێکم دانا باسی جیهادم تێدا کردبوو واتا لەسەر جیهاد نووسیومە نوسخەیەکیم دا بە صەلاحەددین، دەڵێ کاتێ دەیخوێندەوە زیاتر سووردەبوو لەسەر جیهادکردن‌و جۆشی دەدا، هەمووجارێك دەیوت پێویستە من جیهانی ئیسلامیی لە دەست بێباوەڕان ڕزگار بکەم بە جیهادکردن، هەتاوەکو ئەوەش دەڵێ کە صەلاحەددین وتوویەتی: ڕۆژێك دێ من بە هێرشێکی بەرفراوان هەڵدەستم‌و دەچم ئەورووپاش لە دەستی مەسیحییەکان ڕزگار دەکەم!.

**+ لە گفتوگۆیەکدا بە چەندین بەڵگەی مێژوویی تۆ ئەوە دەسەلمێنیت کە صەلاحەددین هەرچەندە خۆی بە بەشێك لە دەوڵەتی عەبباسی زانیوە، بەڵام عەباسییەکان نەیانتوانیووە بە هیچ شێوەیەك دان بەفەرمانڕەوایەتی ئەو سەرکردەیە دابنێن، پێتوانییە هۆکاری ئەو ڕقە یان ئەوە بووبێت کە عەبباسییەکان ناکۆك بوون لەگەڵ فاتمییەکانداو ئەویش لە دەوڵەتی فاتمییەکاندا وەزیر بووە؟، یاخود چی هۆکارێکی تر بووە؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: لەڕاستیدا دەبوو عەباسییەکان زۆر پشتگیری لە صەلاحەددین بکەن، چونکە عەبباسییەکان فاتمییەکانیان بە دوژمنی خۆیان دەزانی، ئیدی صەلاحەددین نەیهێشت دەوڵەتی فاتمی بمێنێت‌و ئەو دەوڵەتەی ئیلغا کردەوە، صەلاحەددین لە ساڵی (٥٦٧ك) لە یەکێك لە مزگەوتەکانی قاهیرەدا لەڕێگای کەسێکەوە کە هەستاو قسەی کرد وتی: ئەوە ئەمڕۆ ئیلغای خیلافەی فاتمیمان کرد لەپاش هەفتەیەکیش خەلیفەی فاتمی (العاضد) مردو بەتەواوی خیلافەی فاتمی هەڵوەشایەوە.

نەك دەوڵەتی عەبباسی و بەڵكو نورەدین مەحمودیش كە زانی صەلاحەددین وەكو كەسایەتییەكی دیار دەركەوتووەو بووەتە سەركردەیەكی دیارو ئازا بەچاوی جاران سەیری صەلاحەددینی نەدەكردو ئەویش مەسەلەی حەسادەتو كورسی بوو، نموونەیەكی بچووكت بۆ بێنمەوە لەسەر عەبباسییەكان، كاتێك خەلیفەی نوێی عەبباسی (الناصرالدين لله) هات موحاسەبەی صەلاحەددینی دەكرد تۆ بە چ حەقێك ناوی خۆت ناوە (الناصر) بەمەرجێك كاتێ صەلاحەددین ئەم نازناوەی وەرگرتبوو لەلایەن خەلیفەی فاتمییەكان (العاضد)، جارێ ئەو مەلیك (ناصر)ە هەر نەهاتبووە سەر دەسەڵاتی، بەڵام بیانوویان بە صەلاحەددین دەگرت، دوایی وتی: باشە ئەگەر كێشە لەسەر ناوە ئەوە من ناز ناوی (ناصر صەلاحەددین) لادەبەم بەڵام ئێوە بەمشێوەیە هەڵسوكەوت نەكەن، ئەوە كەی كێشەیە، من ناو بەلامەوە گرنگ نییە، جا ناو چییە؟!

جا (ابن الأثير) بەنییەتی خراپی خۆی ئەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ شاری (شوبك و كرك) كە لە خواروی ئوردون خاچییەكان داگیریان كردبوو، نورەدین مەحمود–یش هەواڵی نارد بۆ میسر بۆ صەلاجەددینو وتی: خۆتو سوپاكەت ئامادە بن بۆ ئەوەی بچین شاری (شوبك) لە دەست خاچییەكان ڕزگار بكەین لە خواروی ئوردن، (چونكە سوپاكەی صەلاحەددین هێشتا سەر بە نوورەدین بوو)، ئیتر صەلاحەددینیش خۆیو سوپایەكی گەورە ڕۆشتنو چوونە شارەكە، دواتر نورەدین مەحمودیش هات بەخۆیو سوپاوە، بەڵام پێش ئەوەی نورەدین بگاتە ئەوێ، صەلاحەددین كشایەوە لەبەر ئەوەی باوكی مردبوو لە میسر، جا لێرەدا (ابن الأثير) دەڵێ: صەلاحەددین لێی ترساو ئەگەر بهاتایەتە ئەوێ ئەوا صەلاحەددینی لادەبرد، ئەو دەڵێ صەلاحەددین لێی یاخیبوو، بێگومان ئەم قسانەی (ابن الأثير) وانییە!، چونكە ئەو تەمسیلی ئەتابەگییەكانی موسڵی دەكردو لە تێڕوانینی ئەوانەوە شت دەینوسی، هەتاوەكو ئەگەر لە دەستی بێت ئەوا سەركەوتنی (حطين)[1]یش كە صەلاحەددین كردوویەتی بە سەركەوتن ناوی نەدەهێنا، یانی بەردەوام بواری بۆ ڕەخسابێت ڕەخنەی لە صەلاحەددین گرتووە، دوایی صەلاحەددین كە گەڕاوە میصر وتی: مەراسیمی ناشتنی باوكن لەوە گرنگترە، چونكە دوایی خەڵكەكە پێم دەڵێن لە ناشتنی باوكیدا بەشداری نەكرد، ئەوە دەبێتە عەیبەیەك بۆ من، دوایی (ابن الأثير) دەڵێ: ڕاست ناكات، بەڵكو درۆدەكات، بەڵكو لەبەر ئەوەی چاوی بە نورەدین نەكەوێت، ئالێرەوە نورەدین مەحمود هەرچی هەبووایە لەسەر صەلاحەددین ئەوا (ابن الأثير)یش وەكو ئەوان لە نووسینەوەی مێژووەكەیدا مامەڵەی لەگەڵ دەكرد، بێگوێدانە ڕاستییە مێژووییەكان، چونكە صەلاحەددین سەركردەیەكی ئازاو لێهاتوو بوو لە میسرداو دەسەڵاتیی گرتبووە دەست لە هەموو لایەكەوە هەر لە دەوڵەتی عەبباسییەوە تاوەكو نورەدین–یش بەردەوام لە حەسوودیدا بوون بۆ ئەوەی دووچاری شكستی بكەنو ڕقیان لێی بووە، چۆن ڕقیان لێی نابێت؟ هەندێك لە مێژوونووسان دەڵێن: لە شاری مەككەو مەدینە كاتێك لەوتاری هەیینیدا دوعا دەكرا بۆ سەركردەو ئەمیرەكان، وتاربێژەكە دەیوت (الله وفق الأمير) مەبەستی ئەمیرەكەی (مەككەومەدینە) بوو، خەڵكەكەی بەهێواشی دەیانگوت (آمين) واتا بەدەنگێكی نزم، ئینجا دەیگوت (الله وفق خليفة العباسي) هەر بەو شێوەیە (آمين) دەكرا، بەڵام كە دەیگوت (الله وفق مجاهد صلاح الدين يوسف بن ايوب) خەڵكەكە هەمووی بەیەكجار بە دەنگێكی بەرز دەیانگوت (آمين)، ئەم هەواڵانە كاتی دەگەیشتە خەلیفەی عەبباسی پێی ناخۆشبوو، دەیگوت باشە كابرایەكی كورد چییە ئەم هەموو خەڵكە بەدەنگی بەرز (آمين)ی بۆ دەكەن؟، جا عەبباسییەكان پێیان ناخۆشبوو كە میسر پێشتر لە ژێر دەسەڵاتیی عەرەبی فاتمیدا بووەو ئێستاش كەوتۆتە دەستی كەسێكی وا كە ئەوان چارەیان ناوێت (آل عباس) لەكوێو (ئەیوبییەكان) لەكوێ، ئەوان لەسەر بنەمای تەشریفات كاریان دەكرد هەربوترایە فلانی كوڕی فلانی كوری فلان، یان نەیاندەزانی لە مێژوودا دەوری كەشخە لێدان نییە!، بەڵكو كێ موجاهیدەو جیهاد دەكات ئەوە دەوری خۆی دەبینێ، تەنانەت كار بەوە گەیشت كە قودس داگیركرا میللەت بە دەوڵەتی عەبباسیان دەوت بۆ سەربازنانێرن بۆ قودس كە ڕزگاربكرێ لە دەست خاچییەكان، ئەوان ئامادەنەبوون كەس بنێرن ئەوەبوو

[1] حطين (٥٨٣ك ـ ١١٨٧ز) شەڕی بەناوبانگی نێوان صەلاحەددینی ئەیوبیو خاچپەرستەكان، كە لە (٢٤)ی ربيع الثاني ٥٨٣ك ـ ٣ی تەمموزی ١١٨٧ز لەم جەنگەدا سوپای ئەیوبییەكان سەركەوتن بەسەر خاچییەكانداو توانییان شاری قودس لە چنگیان ڕزگار بكەن.

خەڵکەکە بەخۆبەخش چوونە فەلەستین بۆ شەڕکردن، دەبینی ئەو خەڵکەی ناڕەزایی توندیشیان نواند بەرامبەر خەلیفەی عەبباسیو وتیان: چۆن تۆ ئەمیری مسوڵمانانی ئەوە قیبلەی سێیەمی مسوڵمانان داگیر کراوە ناچیت ئازادی بکەیت؟ یانی کاکی خۆم ئەوە هەڵوێستی دەوڵەتی عەبباسی بوو بەرامبەر بە صەلاحەددین ئامادە نەبوو دژی دوژمنەکانی ئیسلام هاوکاری بکات، صەلاحەددین هەواڵی بۆ نارد وتی: بۆ ئەوەی دوایی نەڵێن صەلاحەددین لە کاتی تەنگانەدا داوای یارمەتی نەکردووە، تکایە پێویستمان بە سوپایە بۆمان بنێرن بۆ ڕزگارکردنی شاری (عەککا) لە گەمارۆکردنەوەی خاچ دروشمەکان، عەباسییەکان پێیان قبول بوو قودس داگیر بکرێت، بەڵام صەلاحەددین شکست بێنێ، ئەوە حەسوودییەکەیان بوو.

**+ پێشتر باسی ئیلغاکردنەوەی خیلافەتی فاتمی –ت کرد لەلایەن صەلاحەددینەوە، ئایا لە میسردا نەیاری بۆ دروست نەبوو لەلایەن لایەنگرانی فاتمییەکانەوە؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: بەڵێ فاتمییەکان هەر بەوە نەوەستان بەڵکو ڕووبەڕووبوونەوەی زۆریان کرد لەگەڵ صەلاحەددین، فاتمییەکان کە لە میسردابوون دەستیانکرد بە ڕێپێوان و هاواریان دەکرد دژ بە صەلاحەددین دەیانوت (یا آل علي.. یا آل علي)، چونکە صەلاحەددین توندبوو لەگەڵیان، بەڵام وەکو خەلیفەی عەبباسیو نورەدین مەحمود نەبوو ئەمە لەلایەك ، لەلایەکی تر کە صەلاحەددین ساڵی (٥٧١ك) چووە خواروی فەلەستین بۆ ئەوەی جەنگ دژ بە خاچییەکان بکات، دەنگوباس بڵاوبووەوە وتیان ئەوا صەلاحەددین کوژرا، هەروەکو چۆن لە جەنگی ئوحددا[١] وتیان ئەوا موحەممەد مردوو نەما، ئەمیش بە هەمان شێوە ئەو بانگەشەیان بۆ کرد، (قاضی الفاضل) کە لەگەڵ صەلاحەددین بوو هەستا نامەیەکی بەژێر باڵی کۆترێکدا نارد بۆ میسر[٢] بۆ ئەوەی نەوەك بڵێن نەماوەو دەوڵەتی فاتمیی بگەڕێننەوەو کودەتایەکیان بەسەردا بکەن، لە نامەکەدا نووسی (صلاح الدین حي یرزق) و پاش چەند ڕۆژێکی دیکە دەگەینەوە میسر، لێرەدا ڕووبەڕووبوونەوەی زۆری صەلاحەددین کرا، هەتا ڕەش پێستە (سودانییەکان) لەگەڵ خەلیفە مستنصری فاتمی خزمایەتییان هەبوو لایەنگری فاتمییەکانیان دەکردو زۆر دژایەتی صەلاحەددینیان کرد، هەتاوەکو صەلاحەددین ناچاربوو ژنو پیاوەکانی لەیەکتر جیاکردنەوە بۆ ئەوەی منداڵیان نەبێت، هەروەها گەڕەکەکانی سوتاندن، ئیتر وا دیارە دروستکردنی "دامەزراندنی" هەر دەوڵەتێك پەیوەست بە خوێن ڕشتنبوو!!.

**+ بۆچی (ابن الأثیر) بەدژە هەڵوێستی صەلاحەددین ناودەبەیت لەزۆر شوێندا؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: (ابن الأثیر) زۆر لە شارەزایان دەڵێن کورد بووە، چونکە خەڵکی شاری جەزیرەیە ئەو کاتە پێی وتراوە (جزیرة ابن عمر) لە ناوچەی بۆتان لە کوردستانی (باکور) تورکیا، مینۆرسکی دەڵێ: سەرەتاو سەرچاوەی میللەتی کورد لەوێوە بووە، ئێستا شارۆچکەیەکی بچووکەو دواکەوتووە، چونکە ئیهمالکراوە، بەڵێ ئەم کابرایە کوردبووە بەڵام شعوری کوردایەتی نەبووە.



[١] جەنگی ئوحد: ئەو جەنگە بوو کە لە ساڵی (٣)ی کۆچی لە نێو مسوڵمانەکان بە سەرکردایەتی پێغەمبەری ﷺو موشریکەکانی قورەیشییەکان ڕوویدا، لەو جەنگەدا ئیسلامەکان تێکشکانو قورەیشییەکان سەرکەوتنو ژمارەیەکی زۆر لە مسوڵمانەکانیان کوشت، ئەوەبوو پڕوپاگەندەی ئەوەیان بڵاو کردەوە کە پێغەمبەری مسوڵمانان موحەممەدﷺ کوژراوە.

[٢] لە دەوڵەتی ئەیوبییدا شتی هەبوو کە دەکرێ ناوی بنێین پۆستەی ئاسمانی ـ باڵدار ـ مەبەستمان لەوە کۆتری نامەبەرە ( Homing pigeon) کە لە حاڵەتی لەپڕو خێرا بەکار دەهات، دەوڵەت بەر لە بڵاوبوونەوەی ئامێرەکانی نوێی پەیوەندیکردن لە بەکارهێنانی کۆتری نامەبەر لە گواتنەوەی زانیاریی لێ ڕاهاتبوون بە تایبەت لە کاتی شەڕدا، لەبەر ئەوەی ئەمجۆرە کۆترە زیرەکیو خێرایی فڕینیو دۆزینەوەی لانەکەی تێدایەن تەنانەت ئەگەر چەند ساڵێکیش لەلانەکەی دووربکەوێتەوە.

هەواڵگری لە سەردەمی صەلاحەددیندا، د. نەبەز مەجید، و. کەمال غەمبار، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.

(ابن الأثير) خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێ کە صەلاحەددین بوو بە سوڵتانو فەرمانڕەوا کابرایەك هات بۆلام وتی: (ابن الأثير) دەزانی من صەلاحەددین–م چۆن بینی؟ خەریکبوو سواری ئەسپەکەی دەبوو یەکێك لە کوڕەکانی فەرمانڕەواکانی سەلجوقی قاچێکی گرتبوو تاوەکو سواربێت، کوڕێك لە ئەتابەگییەکیش جلو بەرگەکەی بۆ چاك دەکرد (واتەجلەکانی کۆدەکردەوە)، دەڵێ منیش بەسوکییەکەوە یان بە تەشەرەوە پێموت گوێ مەدەیە (کوڕی ئەیوب) باوکت مەلیك نەبووە!، تازە قەیناکا بشمریت، چونکە بەئاواتی خۆت گەشتیتو بوویت بە فەرمانڕەوا، توخوا حەیف نییە تۆیەکی بێکەس کوڕانی سەلجوقیو ئەتابەگییەك سواری ئەسپەکەت بکەنو جلەکانت کۆبکەنەوەو بۆت بگرن؟؟! ئەتۆ چیت! خۆت بە چی دەزانی؟؟! جا دەڵێ لە دڵی خۆمدا وتم، چی بکەین زەمانەکە وای لێهاتووە صەلاحەددین بێت بەشت!، یانی ئەمە قسەیەکەو (ابن الأثير) بۆ شکاندنی صەلاحەددین هەڵیبەستووە تەنها بۆ ئەوەی بشکێتو بڵێ سەلجوقیو ئەتایەگی کردیان بەو سەرکردەیە کە ناودەربکات.

لە لایەکیتر کاتێك صەلاحەددین زانی مەلیکەکانی موصڵ کە ئەتابەگی بوون پەیوەندییان هەیە لەگەڵ خاچ دروشمەکان، لەدوای ئەوەی هەواڵیاندا بە صەلاحەددین گەیشت کە ئەمانە پەیوەندییان بە ستووە لەگەڵ خاچییەکان، ئەوەبوو بۆی ڕوونبوویەوە کە ئەتابەگییەکان وتبوویان خاچییەکان با بێن ناوچەکانمان بکەوێتە ژێر دەسەڵاتییانەوەو داگیری بکەن نەك صەلاحەددین هێزو توانا پەیدا بکات، واتا ئێمە خاچ دروشمەکانمان قەبوڵە نەك صەلاحەددین، ئەمەش هۆکارەکەی ئەوەبوو سەردەمێك ئەتابەگییەکان دەوریان هەبوو لە موسڵداو دەناسران، بەڵام لە پاشان کە صەلاحەددین دەرکەوت وەکو کەسێکی دیارو ئازا بەرامبەر بە خاچ دروشمەکان، ئیدی ئەمان ناویان نەماو شارانەوە، لەبەرامبەردا دۆستایەتی خاچییەکانیان پێ قەبوڵ بوو تاوەکو صەلاحەددین، بێگومان (ابن الأثير)یش نانخۆرو پیاوی ئەمان بوو، دەبینێ ئەتابەگییەکان تەنها موسڵیان لە دەست ماوە بەڵام صەلاحەددین (میصر، شام، بەشێك لە لیبیا، یەمەن، بەشێك لە کوردستان، سودان.. تاد)، ئەوەبوو صەلاحەددین کاتێ کە بەم پێوەندییەی زانی هیچی نەوت، هەستا هێزێکی گەورەی کۆکردەوەو چوو گەمارۆی شاری موسڵیداو وتی: چۆن پێوەندی لەگەڵ خاچییەکان دەبەستن لەکاتێکدا فەلەستین موڵکی منو موڵکی باوکم نییە، دەچم بە هەموو هێزێکەوە دیفاعی لێدەکەم ئەوەبوو ئەتابەگییەکانیش ژنەکانیان نارد بۆ صەلاحەددین تاوەکو بکشێتەوە، ئەمیش بە ژنەکانی گوت پێیان بڵێن واز لە هاوکاریو دۆستایەتی خاچییەکان بهێنن، وەرنە ناو جیهادەوە خۆ ئەم قەزیەیە تەنها هی من نییەو من لێی بەرپرسیار نیم هی هەموو موسڵمانانە!، جارێکی تریش کچەکەی عیمادەدین زەنکیان نارد بەهەمان شێوە بوو صەلاحەددین هەر داوای ئەوەی لێکردن هاوکاری خاچ دروشمەکان نەکەن، جاری سێیەم دیسان صەلاحەددین هەر هەمان داواکانی پێشووی لێکردن، ئەوەبوو بیریان کردەوە کە سورە لەسەر گەمارۆدانەکە وتیان: ئێمە دەبینە شوێنکەوتەی تۆ: چیت دەوێ بۆت دەکەین، سوپات بۆ دەنێرینو هاوکاریت دەکەین، یانی بەهەموو شێوەیەك هاتنە ناو دەوڵەتەکەی صەلاحەددینو قبوڵکرد.



(ابن الأثير) لەژێر خێرو بێری ئەتابەگییەکان دەژیا، مێژوونووسی کۆشکی فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارێتی ئەتابەگییەکان بوو، ئەوان چۆنیان بویستایە ئاوا مێژووی ژیانیانی دەنووسییەوە "وەك زۆر مێژوونووسانی هەموو سەرلادەمەکان"، یانی بەئاسانی نەیدەتوانی واز لەو خۆشیو لەزەتەی لای ئەتابەگییەکان بهێنێ کە بۆیان ڕەخساندبوو ئیدی چۆن بچێتە لای صەلاحەددینو مەدحی بکات!، لە موسڵ دانیشتبوو هەرچی قسەبوو بە صەلاحەددینی دەگوت، ڕەخنەی لێدەگرت، نەدەبوو وابکات! دەبوو وای بکردایە!، صەلاحەددین ماڵی هەتیو دەخوات ئەمانەی لەکتێبی (الباهر في التأريخ الأتابكي)دا باسکردووە.

نموونەیەکی تری (ابن الأثير)ت بۆ باسبکەم، کاتی خۆی (بدرالدين لؤ لؤ) هەبوو کە لە بنچینەدا ئەرمەنی بوو دوایی ببوو بە ئیسلامو خزمەتکاری ئەتابەگییەکان بوو لە موسڵ، کاتی (الملك القاهر عزالدين مسعود کوڕی نورالدين ارسلان شا)

ئەتابەگییەکان دواین فەرمانڕەوایی ئەتابەگییەکان بوو بە مەلیکی موسڵ، زۆر منداڵ بوو، ئیتر (بدرالدین لۆ لۆ) بوو بە حاکمی موصڵ و پێیان وت: تۆ حاکمی موسڵ بەو هەروەها بە خێوکەری ئەو منداڵەش بە کە تەمەنی (١٢ ـ ١٣) بوو تاوەکو گەورە دەبێت و دەیکەینە حاکمی موصڵ، پاش ماوەیەکی زۆر ئەو کوڕە دیار نەماو لە ناو موصڵدا دەنگوباس بلاوبووەوە کە وترا بەدرەدین ئەو کوڕەی کوشتووە، کە لەلای بووە بەخێوی دەکرد، بەدرەدینیش بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم هەواڵە هەستا کوڕەکەی خستە سەر ئەسپێك و بەناو شاری موسڵدا گەڕاندی بۆ ئەوەی خەڵکەکە قەناعەتی پێ بکەن کە ئەمە منداڵەکەی نەکوشتووەو منداڵەکە ماوە، لێرەدا دەبینی (ابن الأثیر) داکۆکی لە بەدەردین دەکات لە کاتێکدا لەبەرئەوەی بەرژەوەندی لەگەڵ ئەودا بووە بەپێچەوانەوە داکۆکی لە ئەتابەگییەکان ناکات، موسڵییەکان بە ئاسوودەیی گەڕانەوە ماڵی خۆیان و وتیان سوپاس بۆ خوا کوڕی ئەتابەگی نەکوژراوەو ماوە، ئەوەتا بەدرەدین پیشانی خەڵکی دەدات و بەدڵخۆشی گەڕانەوە ماڵیان و ئەو شەوە بەخۆشی خەوتن و هەموویان بێخەمبوون.

لێرەدا شتێکی سەیر هەیە ئەوەی ئەو خەڵکە پێشبینییان دەکرد سەبارەت بە نەمانی ئەو منداڵە ئەمجارەیان بەکردەیی ڕوویدا، بەدرەدین هەستا بە کوشتنی منداڵەکە لەناو حەمامێکی تورکی کە دەرگاکەی دادەخرێت و هەناسەی لێدەبڕێت ئەویش بۆ؟ بیری لەوە کردەوە کە من کەسێکی وا گرنگ و گەورەم و دەسەڵاتدار بۆچی دەبێت حوکم بدەمە دەستی منداڵێکی کەم ئەزموونی تازە پێگەیشتوو، ناوی (الملك القاهر عزالدین)[1] بوو؟ پێی وت کوڕم من دەمەوێت بتکوژم، لەو کاتانەدا عادەت وابوو داوی تیرو کەوان هەیە خڕەو کەوانەیی بووەتەوە ملی کەسەکەی پێدادەکرێت و لە هەردوولاوە دوو کەس ڕایدەکێشێت تاوەکو دەخنکێت، هاتن ئەم منداڵەیان والێکرد ئەوەبوو زۆر ترسا، گوتی: توخوا بەم شێوەیە مەمکوژن ئازارم زۆر دەبێت، حاکم وتی: ئەی چۆن بتکوژم، چونکە نامەوێ بەبێ ڕەزامەندی خۆوت بکوژرێی، شێوازی کوشتنت خۆت هەڵبژێرە، منداڵەکە وتی: بمخەرە ناو حەمامێکەوەو دەرگاکەم لێ دابخە تاوەکو گیانم دەردەچێت، ئاوا باشترە بمکوژیت، تاوەکو گیانم دەردەچێت، ئەویش بەگوێی دەکات و دەیخاتە ناو حەمامەکەوە تاوەکو وای لێدێت خەریکە بمرێت، لەپاشان منداڵەکە هاوار دەکات دەڵێت توخوا قومێك ئاوم بدەنێ، (جا لەڕووی زانستییەوە وایە کەسێك کە لەسەرەمەرگدا بێت داوای ئاوی کرد کە خواردییەوە پاش کەمێك لەخواردنەوەی ئاوەکە دەخنکێت)، بەم شیوەیە حاکمەکە ئاوەکەی دەداتێ و ڕاستەوخۆ دوای خواردنەوەی ئاوەکە گیانی دەردەچێت و دەمرێت،. دەبینی ئەم تاوانە گەورەیە لە کۆشکەکانی پاشاکان زۆر ڕوودەدات (ابن الأثیر) بە بەرچاوی خۆیەوە ئەم کارە دەکرێت بەهیچ شێوەیەك باس لەم تاوانە ناکات، بەڵکو هەموو مێژوونووسەکانی دەرەوەی موسڵ لەم دیاردە نامرۆڤانەیە دەدوێن.

نموونەیەکی دیکە باس بکەم، (ابن الأثیر) دەڵێت: کاتێ گرانی شاری موسڵی گرتەوەهەموو خەڵکەکەی گۆشتی سەگ و پشیلەیان دەخواردو هەروەها گۆشتی خۆیان و یەکتریان سەردەبڕی، هەتاوەکو خۆی دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: ڕۆژێکیان کچێکم بینی خوشکەکەیان سەربڕیبوو گۆشتەکەیان دابەشکردبوون، ئەویش سەری خوشکەکەی بەدەستەوەبوو دەگریا. خەڵکی لێیان دەپرسی بۆچی دەگری؟ ئەویش ئەوەنەبوو بۆ خوشکەکەی بگری کە سەربڕاوە، بەڵکو دەیگوت بۆ ئەوە دەگریم دەبێت گۆشتی ئەم سەرە چی پێوە بێت بۆ من تاوەکو بیخۆم، بۆ ئەوە دەگریم، یانی ئابەوشێوەیە بوو هەربۆیە دەڵێت: پشیلە نەمابوو لە ماڵاندا خەڵکی هەموویان سەربڕیبوو خواردبوویان بارودۆخەکە ئاوای لێهاتبوو، جا (ابن الأثیر) لێرەدا ئەو نموونەیە بۆ خۆی دێنێتەوە دەڵێت: پار ساڵ ئەم کاتە لە ماڵەوە کارەکەرەکەمان گۆشتی دەکرد بە قیمە لەسەر تەختەیەك (گۆشتی ئاژەڵ) کە لەکۆشکی مەلیکەکاندا بوو، دەڵێ پشیلە دەورەی کارەکەرەکەیان دابوو تاوەکو ئێسقانیان بۆ فڕێ بدات، لە پاش ساڵێك چوومەوە بینیم دیسان ئەو کارەکەرە خەریکی قیمە دروستکردنە، بەڵام ئەمجارەیان پشیلە لە ماڵمان نەمابوو

---

[1] الملك القاهر عزالدین: ناوی ئەو منداڵەبوو کە بە دوا فەرمانڕەوای ئەتابەگییەکانی موسڵ دانراو دواتر لەلایەن بەدرەدین لوئلوئەوە لە حەمامێکی تورکیدا خنکێنرا.

خەڵکەکە هەموویان خواردبوو، ئەمیش خۆی بەردەوامە لە خواردنی گۆشتی ئاسایی، باشە (ابن الأثیر) کە ئەمە خۆشی ژیانی بێت لە کۆشکی پاشایاندا خەڵکی گۆشتی مرۆڤو پشیلەو سەگ بخۆن ئەویش گۆشتی ئاژەڵ بخوات چۆن دان دەنێت بە موجاهیدێیتیو قارەمانێتی سەرکردەیەکی کەم وێنەی وەکو صەلاحەددین دا کە هەموو ژیانی خۆی لەپێناوی ڕزگارکردنی خاکی ئیسلامەتییدا تەرخانکرد، (ابن الأثیر)یش خۆیو براکانیو باوکی لەلایەن ئەتابەگییەکانی موسڵەوە زەویو زارو گوندو شوێنی زۆریان لەسەر تەرخانکرابوو چۆن دەچێت ئەوژیانە خۆشە لە خۆی تاڵ دەکاتو ڕاستییەکانی سەردەمی صەلاحەددین باس دەکات کە دەیویست هەموو نەخشەی جیهانی ئیسلامی بکاتە یەك نەخشەو هەموو ئەو خاکانەی کە لەلایەن داگیرکەرانەوە دەستی بەسەردا گیرابوو بگێڕێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتیی مسوڵمانان.

ئەمانە کۆمەڵێك هۆکارن کە (ابن الأثیر) تاکە مێژوونووسێکە لە سەردەمی صەلاحەددین کە وایانکردووە بەچاوێکی سووكو نزم سەیری صەلاحەددینی موجاهید بکات، نەتوانێ دان بەژیانو جەنگو جیهادەکانیدا بنێت کە ئەو بەردەوام ڕووبەڕووی دوژمنەکانی بووەتەوەو داکۆکی لە ئازادکردنی خاکی مسوڵمانان کردووە، نموونەی تر زۆرن بەڵام لێرەدا ناکرێت هەموویان باس بکەین، ئەمانە کۆمەڵێك بەڵگەی دیارن کە لایەنگری تەواوی (ابن الأثیر) دەسەلمێنن بۆ دەسەڵاتدارانی ئەتابەگیی لە موسڵدا، واتە مێژوو نووس نییە (في سبیل الله) مێژوو بنووسێت، بەڵام مانای ئەوە نییە گشت مێژوونووسان ویژدانی خۆیان دەفرۆشن.

**+ ئامانجی هێرشی خاچ دروشمەکان بۆ سەرناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتی (فەلەستینو شامو میسر) لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا بەگشتیو سەردەمی صەلاحەددین بۆ چیدەگەڕێتەوە؟**

ـ دکتۆر موحسین موحەممەد: خۆی ئەم هێرشانە جیا جیا نەبوون بەڵکو دووسەد ساڵ بەردەوام بوو بۆ وڵاتەکانی کوردستانو شامو فەلەستینو میسر، کە پێکهاتبوو لە هەشت هێرشی بەناوبانگ، لە ناو ئەو هەشت هێرشانەش هێرشی بچووکیش هەبووز، بێگومان سەرەتای هێرشەکان پاپا تەبەنای کرد لە کاتێکدا بەهۆی بوونی سۆزو عاتیفەی ئاینییەوە بیریان لە هێرشەکانیان کردەوەو دەستیان بە داگیرکارییەکانیان کرد، کە بەسەرکردایەتی دوو کەسی دیار لە مێژوودا بۆیەکەمجار بڕیاری هێرشەکانیاندا بەناوەکانی بتروسی ڕەبەن (بطرس ناسك)و (والترموفلس)[1].

گەر بگەڕێینەوە بۆ ڕابردوو دەبێت لەو کاتانەدا تێکڕای کاروباری ژیان لەڕێگای ئایینەوە چارەسەر دەکرا واتا لە گشت فەرمانە دنیاییەکاندا کۆمەڵگاکانی ئەو سەردەمە بەتایبەتی ئەوروپا پەنایان دەبرد بەر ئایین بۆ یەکلاکردنەوەی هەموو کارێکیان.

بەنیسبەت هێرشی خاچییەکانیشەوە بۆ سەر ناوچەکانی ڕۆژهەڵات ئەم ناوەی نەبوو، بەڵکو لە سەدەی هەژدەهەمدا ئەم ناوە هاتە کایەوە، بەڵکو پێشتر پێی دەوترا (سلوك طریق الحج)[2].

ئینجا پاپا ئۆربانی دووەم[3] بانگەشەی هێرشەکانی کردو هەر کەسەو کراسێکی سپی لەبەر کردو بە بۆیاخێکی سوور وێنەی خاچێکیان لە پشتییەوە دروستکردو ئەمە بووە جەنگێکی پیرۆز (حرب الصلیب ضد أعداء الصلیب)، جەنگی خاچ دروشمەکان دژ بە دوژمنانی خاچو ڕزگارکردنی شوێنە پیرۆزەکانیان لە فەلەستین (ناصره و بیت لحم و بیت القدس و أورشلیم).

---

[1] (بطرس ناسك)و (والترموفلس): دوو مەسیحی ئەوروپایی بوون کە دەسپێکی هێرشی خاچییەکان بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تەبەننا کردو توانییان ڕۆڵی سەرەکی لە سەرکردایەتی کردنی هێرشی خاچییەکان ببینن.

[2] بەم حەجە دەوترا (الذهاب الی الأرض المقدس)، بە مەفهومی خۆیان کە دەهاتنە ئەم شوێنانە دەبوونە حاجی.

[3] لێرەدا پاپا قودسییەتی دا بەو هێرشانە، چونکە مەرجەعی ئایینی مەسیحییەك کاسۆلیکەکان بوو.

گەر باس لە فاکتەرەکانی هەڵایسانی ئەم جەنگەش بکەین لەڕاستیدا هۆکاری بنەڕەتی پاڵنەری ئابووری بوو، چونکە لەبیریان چووبوو لەسەرەتادا بەناوی ئایین‌و جەنگی پیرۆزەوە شەڕیان دژی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیی دروستکردووە، ئەوەبوو دوای ماوەیەك لەنێوان خۆیاندا لەسەر پارچە زەوییەك یاخود ناوچەیەك میرنشینەکانی مەسیحییەت بوو بەناکۆکییان، واتا دەرکەوت ئەوان شەڕی بەرژەوەندییە ئابورییەکانیان دەکەن، دوایش بینرا کە چۆن لە ڕۆژهەڵاتدا زەوییەکانیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکرد، بنەمای سەرەکی ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە ڕۆژئاواو ئەوروپادا سیستەمی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتی لە دەست مەلیکەکاندا بوو، ئەوەش وایکرد مەلیکەکان پێڕەوی دەسەڵاتیی فیودالیزم‌و دەرەبەگایەتی بکەن، کە ئەمەش جێبەجێکرا ئیدی سەروەت‌و سامان و داراییەکەش ببووە میراتی پشتاو پشت کە باوك دەمرد موڵکییەتەکەی بۆ کوڕەکەی دەمایەوە، پاشان بەهەمان شێوە دوای کوڕەکەی بۆ کوڕەزاو نەوەکانی تری، ئیدی خەڵکانێکی زۆر بێبەش کران لە مافی موڵکدارێتی‌و بوونی زەوی‌و زارو لایەنەکانی تری ئابووری ژیان، لەدوای ئەمانە بیر لەچی کرایەوە؟ بیر لەوە کرایەوە کە ئەوانەی بێبەشبوون و مافیان خوراوە با بچن لە شوێنی تر بۆ خۆیان دارایی و سامان پێکەوە بنێن! ئەو شوێنەش کوێ بوو؟ ناوچەکانی ڕۆژهەڵات بوو، هەر لەڕۆژهەڵاتدا ئەو چینە بەشخوراوە کە لە دەرەوەی سیستەمی فەرمانڕەوایی‌و دەرەبەگایەتی بوون دەیانتوانی بەدوای بەرژەوەندییەکانی خۆیاندا بگەڕێن، ئیدی هاتن‌و بەناوی زەوی پیرۆزو حەجەوە ئامانج‌و مەرامەکانی خۆیان دۆزییەوە، لە تەورات‌و ئینجیلدا باسکراوە کە بەم زەوییانەی ڕۆژهەڵات بەتایبەت فەلەستین‌وتراوە (ئەرزی خەیرات یان زەوی ماست و هەنگوین)، ئینجا پاڵنەرێکی تری ئابووری ئەوەیە ژمارەیەکی زۆر خەڵکی دزو پیاو خراپ‌و جەردە هەبوو لە زیندانەکانی ئەوروپادا، ئەوەندە زۆربوون بەخێو نەدەکران، لەبەرامبەر بەوەدا کە بە خێونەدەکران‌و گرانی‌و قاتی بوو، پێیانوتن بەرەڵاتان دەکەین بچن بۆ ڕۆژهەڵات، ئیسلامەکان بکوژن، ئەوانیش بەدوای شتێکی لەو جۆرەدا دەگەڕان، دەیانووت ئەگەر بکوژرێین ئەوا دەبینە شەهید، گەر نەکوژرێین ئەوا پارەو ماڵی زۆرمان دەست دەکەوێت یانی لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەر لە قازانجماندایە.

هۆکارێکی تر تەقینەوەی زۆری ژمارەی دانیشتوان بوو لە ئەوروپادا، هاتن دەستیان کرد بە ڕاگەیاندنی ئاینی (الأعلام الدینی) بەو ناوەوە کە ئێمە کاتی خۆی خاکمان هەبووە لە ڕۆژهەڵات‌و لەلایەن ئیسلامەکانەوە داگیر کراوەو ئێستا پێویستە بگەڕێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆمان، دەبینی هێرشەکانی (بوترس‌و والتەر) کەپێشتر باسمان کرد سەرکەوتوو نەبوو، بەڵکو جارێکی تر پاپا هێرشی تری دەست پێکردەوەو نوێنەری خۆی بەناوی (أدهیمر)[1] نارد لەگەڵ خاچ دروشمەکان.

لەدوای ئەمانە هێرشەکان دەستی پێکرد بە بەشداری زۆرێك لە کەسە ئاینییەکان یەکەم جار هاتنە (قستنطینیة ـ بیزنطة)[2]، خەڵکی ئەوروپای ڕۆژئاوا زۆر هەژارو نەدار بوون، کاتی هێرشەکەیان گەیشتە بێزەنتە بینییان ئەم هەموو کۆشك‌و جوانییەی شارو بوونی چەندەها بەهای زۆر دەوڵەمەند، وتیان چۆن ئەمانە مەسیحین‌و ئێمەش مەسیحین؟ باشە بۆچی ئەمانە ڕەحمیان بە حاڵی ئێمە نەکرد، هاتن دەستیانکرد بە تالانکردن‌و بردنی هێندێ سەروەرت‌و ماڵی بێزەنتەو بە جارێك هێرشیان بۆ هێنا، ئالێرەدا ئیمپراتۆری بێزەنتە کە ناوی (کومنین)[3] بوو، وتی نابێت ئێوە بێنە ناو شارەوە کە بەم شێوەیە ڕش‌و ڕووت‌و هەژارو تالانکەرن دەبێت بچنە دەرەوەی شار ئەمە خاڵێك، خاڵێکی تر دەبێت ئەو شوێنانەی کە لەژێر دەست ئیسلامەکان وەریدەگرن‌و پێشتر لە دەستی ڕۆمەبێزەنتینییەکاندا بووە دەبێت بیدەنەوە بە خۆمان نەك بۆ خۆتان هەڵی

---

[1] پاپا ئەم نوێنەرەی ناردو وتی: لە جیاتی ئەوەی من لەگەڵتان بەشداربم ئەوە نوێنەری منەو سەر پشکە لەوەی هەرچیتان پێویست بوو بگەڕێنەوە بۆ لای‌و پرس‌و ڕاوێژی پێ بکەن.

[2] واتا ئەستەمبووڵی ئێستا، ئەو کاتە پایتەختی ڕۆمە بێزەنتیەکان بوو.

[3] ئیمپراتۆری قوستەنتینیەبوو، کچەکەی بەناوی (ئانا کومنین) یاداشتەکانی نووسیوەتەوەو بینیویەتی کە چۆن مەسیحییەکانی ڕۆژئاوا پەلاماری کۆشکەکەی باوکی دەدەن لەوێدا باسی دەکات.

بگرن، دەستی بەسەرا بگرن. پاشان مەسیحییە خاچپییەکانی ڕۆژئاوا بە مە ڕازینەبوون گوتیان چۆن دەبێت ئێمە بچین ئەو شوێنانە داگیر بکەین‌و خۆمان بە کوشت بدەین‌و ماندوو بکەین دوایی تەسلیمی بێزەنتینەکانی بکەین؟، ئەوەبوو بە مە ڕازینەبوون مەرجەکانی ئیمپراتۆریان قەبوڵنەکرد، جالێرەوە ناکۆکی دروست بوو لە نێوان هەردوو لادا مەسیحییەکانی ڕۆژئاواو بێزەنتەکان، ئا لەم سەرەتایەوە ناکۆکی نێوان هەردوو ئیمپراتۆری ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات کە مەسیحی بوون سەریهەڵدا یاخود ململانێی کەنیسەی (ڕۆژهەڵات ـ ئەرسەدۆکس)و (ڕۆژئاوا ـ کاپولیکی) دروست بوو وای لێهات ئەم ئیمپراتۆرە هەر جارێك خاچپییەکان بهاتنایە بۆ قوستەنتینیە لە گەرووی بۆ سفۆر ڕێگایان پێدەگرتن‌و نەیدەهێشت بچنە ناو شارە مەزنەکەوە، پاشان خاچ دروشمەکان هاتن بەرەو خوارەوە واتا بەرەو باشووری قوستەنتینییە، واتا باشووری وڵاتی ڕۆمەکان، لەوێ یەکەمین میرنشینیان بەناوی (ڕۆحا ـ ئەدیسا)[١] دروستکرد کە پێشتر حاکمەکەیان ئەرمەنی بوو دەریانکرد، ئالەوێوە ناکۆکی نێوان مەسیحییەکانی ئەرمەنییەکان‌و مەسیحییەکانی ڕۆژئاواش دەستی پێکرد[٢]، لەکاتێکدا پێشتر ئەرمەنییەکان زۆر حەزیان دەکرد هێرشی خاچپییەکان سەرکەوتن بەدەست بێنێت، چونکە ناوچەی کیلیکیا لە تورکیایان بە دەستەوەبوو هەروەها ئەرمینیای گەورەو بچووکیان لە دەستدابوو.

لەدواییدا ڕۆشتن تاوەکو گەیشتنە باکووری وڵاتی شام کە ئێستا پێی دەوترێت (سوریا) چوونە شاری (ئەنتاکبەکیە)[٣] کە مەڵبەندێکی ئاینیی ئەرسەدۆکسەکان بوو تاوەکو ئێستەش هەروایە، ئینجا (کەربوغا)[٤] دەستی کرد بە بەرگریکردن‌ولەدوای ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی زۆر بۆ دواجار خاچ دروشمەکان توانییان دەست بەسەر شارەکەدا بگرن ئەویش لەڕێگای ڕۆحانییەوە هاتن ئەو دیعایەیان بڵاوکردەوە کە گوایە خەوبینراوە بە سەید مەسیحەوە وتوویەتی: ئەو خاچەی کە منی پێدا کرا پارچەیەکی لە ژێر دیوارێکدایە لەشاری ئەتاکیەو دەبێت بچنە ئەو شارەو پارچە خاچەکە دەربهێنن، من خۆم لەگەڵتانم بچنە ناو شارەکەوە، لەوانەیە ئەم خەونە خەونێکی ڕاست نەبوو تەنها لە بۆئەوەبوو کە خاچ دروشمەکان شەڕ بکەن‌و مەعنەویاتیان نەشکێت، لە پاشان کە چوونە ناو شارەکە ڕۆشتن دیوارێکیان تێکدا یەکێك لە پیاوە ئاینییەکانیان هاواری کرد وتی: ئەوە پارچە خاچەکەم دۆزییەوە، کەواتە مەسیح لەگەڵماندایە، ئەمەواش نییە، هەروەکو هەندێ لە سەرچاوە مەسیحییە عەلمانییەکان کە نوێترن دەڵێن ئەوە شتێکی مودەبەربوو! ڕاست نەبوو خۆیان دروستیانکرد!.

لە کۆتایی ئەم بانگەشەیەدا توانییان سەربکەون‌و بچنە ناو شارەکە لەدوای ئابلۆقەدانێکی زۆرو هەموو ئیسلامەکان بکوژن‌و (بۆهیمەند)[٥] یان لەوێ دانا، ئینجا چوونە خوارەوە بەرەو ناوچەکانی لوبنان، چوونە تەرابلوس لە حاکمەکەی[٦] وتی: کاکە گیان کەس مەکوژن ئەوە شارەکەتان دەدەمێ من چاری ئێوە ناکەم، خاچ دروشمەکان چوونە ناوەوەو لەوێش میرنشینی سێیەمیان دامەزراندو (ریمۆند)[٧] یان بۆ دانا بە حاکمی ئەو شارە، یان ئەو میرنشینە.

خاچ دروشمەکان بەمانەوە نەوەستان، بەڵکو بەرەو ناوچەکانی فەلەستین‌و قودس ڕۆشتن‌و فاتمییەکان زۆر بە توندی ڕووبەڕوویان وەستان، لەدوای کوشتارێکی زۆر لە هەردوولا ئەوەبوو فاتمییەکان تێك شکان‌و خاچپییەکان چوونە ناو قودس‌و لەوێش مەملەکەتی (بیت المقدس)یان دامەزراند، تاوەکو ئێستا ئەوە سێ میرنشین‌و مەملەکەتێکیان بەو ناوەوە

---

١ ئەو ئەمیرەی بۆ ئەم میرنشینە دانرا ناوی (جۆسلین) بوو.

٢ مەسیحییەکانی ئەرمەنی نەستووری بوون، ئەم ناکۆکییە بووە ناکۆکی نێوان نەستورییەکان‌و کاسۆلیکەکان.

٣ شارێکی مەسیحییە، لە ساڵی (١٩٣٦)ەوە لکێنراوە بەتورکیاوە، سوریاییەکان تاوەکو ئێستاش بەخاکی خۆیانی دەزانن.

٤ سەرکردەیەکی ئیسلامیی تورك بوو، ئەو کاتە سەر بەدەوڵەتی سەلجوقییەکان بوو، بەڵام وەکو ڕەمز سەر بە عەباسییەکان مابوویەوە.

٥ (بۆهیمند) سەرکردەیەکی مەسیحییەکان بوو لەدوای گرتنی شاری ئەنتاکیە کرایە سەرۆکی میرنشینی ئەنتاکییە.

٦ ئەم حاکمە ئیسلامی بوو میرنشینەکەی ناوی (بەنی عەمار) بوو.

٧ ریمۆند یەکێك لە سەرکردە مەسیحییەکانی (کاتۆلیك) بوو کە لە پاش گرتنی تەرابلوس لەوێ کرایە حاکم.

دامەزراندووە، هەرچەندە بۆ دواجار یەکەم میرنشین کە (ڕووها) بوو لەلایەن مەسیحییەکانەوە دروستکراوە، وە یەکەم میرنشین بوو لە لایەن عیمادەدین زەنگی ئەتابەگییەوە جارێکی تر گەڕاوە باوەشی ئیسلام.

کەواتە سەرجەم ئەو هێرش و داگیرکاریانەی کە مەسیحییەتی ڕۆژئاوایی پێی هەستا بۆ ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەموو بەرژەوەندی داگیرکاریو دوژمنایەتی سەرەکی ئاینی گەلانی ڕۆژهەڵات بووە کە (ئیسلام)ە، بەڵام هەر جارەو لە ژێر دروشمەو ناوێکدا بووە، ئەگینا ئەوان هیچ بەشو هیچ شتێکیان نەبووە کە وەکو ڕەسەنایەتی بیانگەیەنێتە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیی، ئەوەبوو لەدواییدا سەرکردەیەکی دیاری وەکو صەلاحەددینیان بۆ هەڵکەوت کە توانی بەئازایەتیو ناوبانگی خۆی هەموو هێرشەکانیان تێك بشکێنێتو لە ڕۆژهەڵات وەدەریان نێت.

**+ ئایا لە سەدەی یانزەیەمینی زاینیدا هەموو خاچ دروشمەکانی ڕۆژئاواو ئەو مەسیحییە کە دانیشتووی ڕۆژهەڵات بوون، یەکدەنگبوون بۆ ئەوەی هێرش بکرێتە سەر ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیی، یان بیروڕای جیایان هەبوو بۆ کردەوە سەربازییەکانیان لەم ناوچانەدا؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: جگە لە مەسیحییەکان ئیمپراتۆریەتی بێزەنتینی، مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵات لە سەرەتادا بە هیچ شێوەیەك ئاگایان لە هێرشی خاچ دروشمییە نەبوو، لە مێژووشدا ناویان نەهاتووە بەهیچ شێوەیەك کەویستبێتیان دژایەتی لەگەڵ خەڵکی خاکی خۆیان کردبێ، لەگەڵ ئەمانەدا مەسیحییەکانی ڕۆژئاوا کاتێك هاتن بەچاوێکی سووك تەماشای مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵاتیان دەکرد، پێیان دەوتن: ئێوە نەتانتوانیوە بەرگری لە ئاینی خۆتان بکەن، ئامادەش نین هاوکاری ئێمە بکەنو بەشدارییان لەگەڵ بکەن، هەرچەندە هەندێ پێیانوایە کە مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵات هاوکاریو ڕێ نیشاندەری ڕۆژئاواییەکان بوون، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە، بە پێچەوانەوە زۆرێك لە عەرەبە بە دووەکانی (سینا)و (خوارووی ئوردن) لە سەردەمی صەلاحەددینو پاش ئەویش خیانەتیان کرد چوون بوون بەڕێ نیشاندەرو یارمەتیدەری خاچ دروشمەکان، لەبەر ئەوە صەلاحەددین خودی خۆیشی متمانەی بەمانە نەدەکرد، هەتاوەکو ئەوکاروانانەی کە خۆراكو شتوومەکیان بۆ دەهێنان لە وڵاتی میسرەوە بۆ شام صەلاحەددین خۆی سەربازی بۆ پارێزگاریکردنی دەناردن، متمانەی بە عەرەبەکانی بیابانی میسرو خوارووی ئوردن نەدەکرد، چونکە ناوبانگیان بەوە دەرکردبوو کە جاسوسی خاچ دروشمەکان بوون، هۆکارەکەشی نەخوێندەواریو نەزانییان بوو، چونکە وایان نەدەزانی کە ئەم کارەیان شتێکی هەڵەیەو خیانەتە، من لە گفتوگۆی نامەی دکتۆرانەکەم ڕەخنەم لێگیرا لەسەر ئەوەی کە ناوی عەرەبەکانم نەهێناوەو بەخراپ باسی بەدووەکانم کردووە، وتم: تاکە سەرچاوەیەکەم بۆ بهێنن کە باسی بەشداری عەرەبەکانی کردبێت، یەك سەرچاوە نییە باسیان بکات، بکات تەنها باسی عەرەبە بیانییەکان نەبێ.



**+ بۆچی مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵات ڕقیان لە مەسیحییەکانی ڕۆژئاوا بوو؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: لەوانەیە لەبەر ئەوەبووبێت کە ڕۆژئاواییەکان بۆ ماوەیەکی کاتی لە ڕۆژهەڵاتدا دەمانەوە، ئیتر بۆچی پێوەندی خۆیان لەگەڵ ئیسلامەکان تێکبدەن لە کاتێکدا زۆر ئازادانە دروشمو لایەنە عیبادییەکانی خۆیان مومارەسە دەکرد، گەر تەماشای کتێبەکانی (ابن العبري) بکەیت یەکەمیان بەناوی (تأريخ مختصر الدول)و دووەمیان (تأريخ الزمان)ە، یەکەمیان بە عەرەبیو دووەمیان بە (سریانی) نووسیویەتی کە چۆن کەنیسەو دێرەکانی ڕۆژهەڵات لەژێر دەسەڵاتیی ئیسلامەکاندا پارێزراو بوون، ئەمەش هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئیسلامەکان ئەوانیان بە (أهل الذمة)[١] دادەنا نەیاندەهێشت کەس دەستدرێژی بکاتە سەریانو ژیانیان لە هەموو مەترسییەك دەپاراستو تەنانەت عیبادەتو ئاینداری خۆشیان دەکرد.

---

[١] پێشتر ئەم چەمکەمان باسکرد بۆ ئەوانە بەکار دەهات غەیری مسوڵمان بوونو لەژێر دەسەڵاتی ئیسلامدا بوون.

**+ کەواتە ئەوان نەهاتبوون ئەمان ڕزگار بکەن؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: لەچی ڕزگاریان بکەن؟ ئەوان عیبادەتی خۆیان دەکەن! بە واجبەکانی خۆیان هەڵدەستن، یانی مەسیحییەکانی ڕۆژهەلات دەترسان لەوەی کە ئەو مەسیحیانەی ڕۆژئاوا هاتوون ژیانیش لەمان تێکبدەن‌و دووچاری شەڕو دەربەدەرییان بکەن.

جا مەسیحییە ڕۆژئاواییەکان زۆر دەمارگیربوون، لە سەرەتاوە کە هاتبوون زۆر ڕقیان لە ئیسلامەکان بوو، دەمارگیرییان ـ بێگومان ـ بۆ ئایینی خۆیان هەبوو، بۆ ناوچەکانی خۆیان هەبوو، بۆ خەڵکەکەی خۆیان هەبوو، جایەکێك لەو نووسەرانە کە لەو سەردەمەدا دەژیا عەرەب‌و ئیسلام بوو، ناوی (ئوسامە بن المنقذ)و لە نەوەی میرەکانی (بن المنقذ)بوو، میرنشینەکەیان لە شاری (شیزر) نزیك شاری (حەما) لە وڵاتی شام بوو، دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ڕۆشتم لە (بیت المقدس) نوێژ بکەم پرسیم بە یەکێك لە مەسیحییە کۆنەکانی ڕۆژئاوا کرد وتی: برۆ زۆر ئاساییە نوێژی خۆت بکەو ئازادبە، کاتێك کە دەستم کرد بە نوێژ یەکێك لە مەسیحییە ڕۆژئاواییەکان، کە تازە گەیشتبووە (بیت المقدس) هات‌و دەستی گرتم‌و نەیهێشت نوێژەکەم بکەم، ئەمە جیاوازی نێوان مەسیحییەکانی ڕۆژئاوابوو بە مەرجێك (ئوسامە) خۆی تێکەڵی زۆریشی هەبوو لەگەڵ مەسیحییەکانداو برادەریان بوو.

لەلایەکی ترەوە ئەو مەسیحیانەی ڕۆژئاوا زۆر دواکەوتوبوون لە چاو ئیسلامەکاندا، ئیسلامەکان پێشکەوتوون بوون لە چاو ئەوان، هەتا نموونەیەکت بۆ بڵێم ئەوان کە هاتنە ڕۆژهەلات نەیاندەزانی کەوچك چییە؟ کە دەیانبینی نانی پێدەخورا، دەیانووت ئەوە چییە؟ بۆ چی بەکاردێت؟ هەروەها زۆر لەو میوەو خۆراکانەیان نەبوو کە لێرە هەبوو، چونکە کاتێك گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان چوون تۆوی زۆر لە میوەکانیان لە گەڵ خۆیاندا برد، بۆ ئەوەی لەوێ بیچێنن‌و لەو میوەیان دەست بکەوێت.

مەسیحییەکانی ڕۆژئاوا کاتێك دەهاتن بۆ شەڕ ئافرەتی سووك‌و بەدڕەوشتیان لەگەڵ سەربازەکان دەهێنا، ئەڵبەت لای ئێمە وانییە، بەڵکو لای ئەوان شتێکی ئاسایی بوو، ئەوە ببووە نەریتێکی دیار لە ناویاندا، بەلام مەسیحییەکانی ئێرە وانەبوون ئەوەشیان پێ ناخۆشبوو، پێویستە ئاماژەیەکی تر باس بکەم هەندێ نووسەر لە ڕاگەیاندنەکان لە سەدەی بیستەمدا تا ئێستاش ئەو پڕوپاگەندەیان بلاوکردبوویەوە کە گوایا کاتی خۆی مەسیحییەکانی ڕۆژهەلات هاوکاری ئەوانەی ڕۆژئاوایان کردووە بۆ داگیرکردنی قودس‌و هەروەها جەنگاندن دژی عیمادەدین زەنکی‌و نورەدین مەحمودی ئەمانە هەمووی درۆیە. لەلایەکی تر نووسەرە عەرەبچییەکان وا نیشان دەکەن کە مەسیحییەکانی ڕۆژهەلات زۆربەی زۆریان لەیەك بەرە (جبهة) جەنگیان دەکرد، ئائەوەش ڕاست نییە، باشترین نموونەش فیلمەکەی صەلاحەددینە بەناوی (الناصر صلاح الدین) کە لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا، واتە لەسەردەمی (جمال عبدالناصر) بلاوکرایەوە ئەوە وانییەو فیتی قەومییە عەرەبییەکان خۆیانە بەهاندانی عەبدولناسر ئەوەیان کرد، هەرچەندە دواتریش پەشیمان بوونەوە کە عەبدولناسر مرد، بەڵکو ڕاستییە مێژووییەکەی ئەوەیە کە لە پێشەوە باسم کرد، بەلام ئەوە مەوزوعێکەو قەومییە عەرەبەکان‌و قەومییە مەسیحییەکان دەیوروژێنن.



**+ لەپاش ئەو هێرشانە خاچییەکان بۆ ڕۆژهەلات کردیان، یاخود دواتر کشانەوەو چوونەوە بۆ ڕۆژئاوای خۆیان، دەبینین لەم دواییانەدا بزووتنەوەی مژدە دەر (تبشیر)و هەروەها لەم دواییانەی تریشدا ڕۆژهەلاتناس (الأستشراق) دروست بوون کە زۆربەیان مەسیحی بوون‌و بۆ ڕۆژهەلات دەهاتن، پێتوانییە ڕقی ئەو سەردەمەی ڕابردوویان مابێت‌و ئێستا بەم شێوازە دەریببڕن؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: خاچ دروشمەکان لەو کاتەدا هەر هەموویان کشانەوە لەڕۆژهەلاتدا بە سەربازو بە میرو بە سەرکردەو نوێنەری پاپاو گشت پیاوە ئاینییەکانیان، یانی لەناوچەکانی ڕۆژهەلاتدا بە جارێك بارگەو بنەیان نەما، تەنها مەگەر وەکو ناوی خێزان مابن، هەندێکیان بە کەمی مانەوە بۆ نموونە خێزانی (ئارنۆڵد)، (ریچارد)، (صەلیبا) ئەمانە مانەوە

دیارە دواتریش ژمارەیەکیان بوونە مسوڵمانو ئەوانەشیان کە نەبوونە مسوڵمان بەجیا ڕۆشتن پێکەوە لەشوێنی جیاجیادا دانیشتن.

بەڵام بەنیسبەت بزووتنەوەی بە مەسیحی کردن ئەوە شتێکە و هەبووە، وەکو ئایینی خۆیان بانگەوازیان بۆ کردووە، بڵێین چۆن دینەکانی تر بانگەشە بۆ دینەکەی خۆیان دەکەن، ئاواش بەهەمان شێوە ئەمانیش بەدوای ئەوەدا دەگەڕان کە خەڵکی بهێننە سەر ئایینی مەسیحی ئەمانەش لە (فلیپین)و (باکوری ئەفریقا) باشترین نموونەن کە بزووتنەوەی مەسیحی تێدا هەبووەو توانیشیان ڕۆڵی خۆیان بگێڕن.

دەبینی ئێستا لێوارەکانی کیشوەری ئەفریقیا مەسیحینو بە ئایینی ڕەسمی خۆشیان ڕایانگەیاندووە، ئەوەش لە چ ڕێگایەکەوە بووە؟ لەڕێگای بازرگانییو تێکەڵیکردنو پارەو کۆمەڵێك شتی تری جیاواز کە ڕێگای ئیقناعکردن بووە بۆیان.

ئەوەت پێ بڵێم کەنیسەکانی ڕۆژئاوا بەردەوامن لە بڵاوکردنەوەی بزووتنەوەی مەسیحییەتو بڵاوکردنەوەی ئاینەکەیان، پێویستە ئێمەش وەکو مسوڵمان بەردەوام بین، ئەوەتا لە فەرەنسا چوار ملیۆن مسوڵمان هەیە، لە بەریتانیا زۆربەی ئەوانەی کۆچیان کردووە لەوێن هەر لەهیندو پاکستانیو عەرەبو کوردو فارسو تورکو.. تاد، هەموو مسوڵمانان، دەبا ئیش بکەن بۆ دینەکەی خۆیان، بەردەوام بن لەوەی خەڵك بکەن بە ئیسلامو نەوەستن، کەس ڕێگریان نییە.

بەنیسبەت ڕۆژهەڵاتناسەکانیشەوە ڕاستنییە هەموویان مژدەدەری مەسیحی بن! ، بەڵام لە ناویاندا ژمارەیەکی مژدەدەری مەسیحی هەیەو ئەوانیش هەردرێژە بەو ڕێگایە دەدەن کە پێشتر هەبووە، بەڵام مژدەدەرەکانی ڕابردوو بەشێکیان ڕۆژهەڵاتناس بوون، بەڵام بەپێچەوانەوەش ڕۆژهەڵاتناسەکان مژدەدەرنەبوون بەڵکو هاتوون بەناوی ڕۆژهەڵاتناسی، بەناوی زانستو زانیاریو شارەزابوون لە کلتورو نەریتو ئایینو ژیانی میللەتانی ڕۆژهەلات ئیشی خۆیان کردووە کە بریتی بووە لە بانگەوازکردن بۆ ئایینەکەیانو کۆکردنەوەی خەڵكو لایەنگر بۆ مەسیحییەت.

ئینجا پێشتریش ناوی ڕۆژهەڵاتناسی نەبووە کە ئەم کارانەیاندە کرد، ئەم زاراوەیە لە سەدەی هەژدەیەمو نۆزدەیەمدا پەیدا بوو، لە کۆنتردا ئەمانە پێیان دەوترا (دیراسات)، واتە دیراساتی ئایینو زمانو ئەدەبو نەریتی میللەتانی ڕۆژهەلات لەچینو بابانەوە تاوەکو ناوەڕاستی ئاسیاو ئێران و تورکیاو کوردستان و دورگەی عەرەبو وڵاتی شام و میسرو مەغریبی عەرەبی.. هتد.

بەڵێ، بە بەردەوامی ئەم بزووتنەوانە لە بنەڕەتدا بریتیبووە لە کارکردن بۆ گەڕاندنەوەی ئەو شوێنانەی کە پێشتر لە ژێر دەسەڵاتی مەسیحییەکاندا بوونو مسوڵمانەکان داگیریان کردون، ئێستا بابیێنەوە بۆ لای خۆیان وەکو (ئەندەلوس) و چەند شوێنێکی تر، بەڵام بەداخەوە لەبەرامبەر ئەمانەدا ئیسلامەکان یەکدەنگ نەبوونو لە زۆر شوێندا هاوکاریو دەست تێکەڵکردنیان لەگەڵ خاچییەکاندا دەکرد، هەتاوەکو بەزەلیلی لە هەندێ شوێنی ئیسپانیادا ناوچەکانی خۆیان تەسلیم بە (ئەلیزا بێتو فردیناند) کرد، هۆکارەکەش چیبوو؟ پێشتر باسم کرد زیاتر ئەوانە عەرەبە بەدووەکان بەربەرو ئەمازیغییەکان بوون، نەخوێندەوار بوون،پوختەی قسەکانم ئەوەیە مەسیحییەکان تاوەکو سەردەمی شەڕو هێرشکردن بوون هاتن لە ڕۆژهەڵات هەموو هێزی خۆیان تاقیکردەوەو جەنگیان لەگەڵ مسوڵمانەکاندا کرد، لە دوایشدا کە ئەمە نەماو تەواو بوو کشانەوە بۆ وڵاتی خۆیان ئینجا سەردەمێکی نوێیان دەست پێکرد کە بریتیی بوو لە بانگەوازکردنو گەڕانو بڵاوبوونەوەیان بەهەموو جیهاندا، جیهانی ئیسلامییو شوێنەکانی تر تاوەکو بایەخو گرنگی بۆ دینەکەیان بگێڕنەوەو ئەمجارەیان بەڵکو بە م ڕێگایە سەرکەوتن بە دەست بهێنن، بەڵام ئەوە کاری ڕۆژهەڵاتناسەکان نەبوو.

**+ صەلاحەددین لەگەڵ ئەوەدا کە دوژمنێکی سەرسەختی خاچییەکان بوو، کاتێك دەیبینی لەشەڕی (حطین) بەسەریاندا سەردەکەوێت مامەڵەو هەڵسوکەوتی لەگەڵ دیلەکانی شەڕدا، لەگەڵ خاچییەکان زۆر لە سەرخۆ دەبێتو بەگیانی لێبوردنەوە لەگەڵیان دەجووڵێتەوە، یان کاتێك (ریچارد شێردل) سەرکردەی هێزی**

**ئینگلیزەکان کە هاتووە شەڕی لەگەڵدا بکات، تووشی دەردو نەخۆشی بووە، لێرەدا صەلاحەددین بەفرو میوەی بۆ دەنێرێت تاوەکو چاك بێتەوە، بەڵام لەدوای ئەوەی خاچییەکان کە شاری عەککا (عکا)یان داگیر کرد، (شێردڵ)[1] زۆر دڵڕەقانە نزیکەی (٣) هەزار مسوڵمانی بەجارێك کوشت، دەتوانین ئەم هەڵوێستانە چۆن لێك بدەینەوە؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: جا ئەگەر صەلاحەددین بەگیانی تۆڵەسەندنەوەوە بجولایەتەوە ئێستا مێژوو چۆن باسی دەکرد، ڕۆژئاواییەکان ئێستا پێی دەڵێن ئەوە سوارچاکی حەقیقیو ڕاستییە، ئەگەر صەلاحەددینو وای نەکردبا، ئەوان نەیاندەتوانی دان بەو ڕاستیانەدا بنێن، کە صەلاحەددین ئەنجامی داون، پیاو دەبێت وابێت بە ئازایەتیو لێهاتوویی خۆی وڵاتی خۆی ڕزگار کرد، دواتریش مامەڵەی لەگەڵ دوژمنەکانیدا بەو شێوەیە بوو، ئەم کارانەی صەلاحەددین کە دەیکردلەبەرژەوەندی مسوڵما نەکاندابوو، چونکە خاچ دروشمەکان دەیانگوت ئێمە دڵنیاین لەوەی صەلاحەددین نامانکوژێتو نەرمە لەگەڵمان، شارەکانی تەسلیم بکەینو بگەڕێنەوە دەستی مسوڵمانەکان، ئەگەر خاچییەکان بیانزانیایە کە صەلاحەددین دەیانکوژێت، ئەوا ئەوانیش شەڕیان دەکردو کوشتاریان لە هەردوولا دەبوو، بەڵام ئەم پیاوەحەلیم بوو، کابرایەکی زۆر ژیرو لێزانبوو، دەیزانی بە کەمترین خوێن ئەو شارانە ڕزگار دەکات لە دەستی خاچ دروشمەکان، ئەوە سیاسەتی صەلاحەددین بووە، صەلاحەددین زۆر ئازایانە کاتی ڕیچارد نەخۆش دەکەوێت دەچێت پزیشکی خۆی بۆ دەنێرێت بۆ ئەوەی چارەسەری نەخۆشییەکەی بۆ بکات، نەك وەك فیلمەکەی (ناصر صلاح الدین) دەڵێ: ناوبراو چووە بە دزییەوە (عەباکەی) خۆی لابردووە دەچێ شێردڵ چارەسەر دەکات، ئەمە ڕاست نییە، یەکەم صەلاحەددین هەر عەبای بەسەرەوە نەبووە، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تر صەلاحەددین پزیشك نەبووە، بەڵکو ئەویش پزیشکی هەبووە، ئەمە درۆیەو ڕاست نییە، ئەمە سیفەتی جوانی صەلاحەددین بوو دەچوو پزیشکی دەنارد تا دوژمنەکەی چارەسەر بکات (نەك ئەوەی پێی بڵێت بڕۆ دەرزییەکی ژەهراوی لێبدەو بیکوژە)، لەبەرامبەر ئەوەدا ڕیچارد کاتێ شاری عەککای داگیر کردو ژمارەیەکی زۆر دیلی گرت هەروەکو وتت (٣) هەزار کەس بوون، هەواڵی ناردبوو بۆ صەلاحەددین وتی: پارەم بۆ دەنێری یاخود هەموو ئەو دیلانە بکوژم؟ صەلاحەددینیش بۆ ئەوەی خوێنی ئەو هەموو مسوڵمانە نەڕێژێت وەڵامیدایەوە پێی وت: باشە پارەت بۆ دەنێرمو ئەوا یەکەم وەجبە دەست پێدەکەم، ئەوەبوو دەستیکرد بە کۆکردنەوەی پارەکەو وەجبەی یەکەمی تەواو کردو ناردی بۆ ڕیچارد، پێش ئەوەی پارەکە بگاتە دەستی ڕیچارد هەر (٣) هەزار دیلەکەی کوشت، هەواڵیان نارد بۆ صلاحەددین کە شتێکی وا بووە، ئەمە هەڵوێستی صەلاحەددینو ئەوەش هەڵوێستی ڕیچارد! بەڵام ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە ئابڕووی ڕیچاردی برد، تەنانەت مێژوونووسانی ڕۆژئاواییەکان ئیدانەی دەکەن.

**+ نەخۆشکەوتنەکەی شێردڵ چۆن بوو؟ کاتی صەلاحەددین بەمەی زاینی چی بۆ نارد؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: لەو کاتانەدا ڕیچارد شێردڵ لە دەرەوەی قودس بوو، صەلاحەددینیش لە ناو قودس بوون کاتێ نەخۆشکەوت هەواڵیان هێنا بۆ صەلاحەددین کە سەرۆکی سوپای خاچییەکان نەخۆشە، ئەویش بەنێردراوی خۆیدا ئەو کاتە هەستا میوەی تایبەتی بۆ نارد وتی: بەڵکو چاك بێتەوەو لە نەخۆشییەکەی ڕزگاری بێت.

لێرەدا دەمەوێ نموونەیەکی ئەو سەردەمەی صەلاحەددین باس بکەمو پەیوەستی بکەم بەو کاتەوەی کە لەبەغدا بووم، (ابن شداد) دەگێڕیتەوەو دەڵێت: ڕۆژێکیان هەواڵ بۆ صەلاحەددین هات کە گوایە ڕیچارد شێردڵ بڕیاریداوە هێرشێکی

---

[1] ڕیچارد شێردڵ سەرکردەیەی ئینگلیزەکان بوو کە هات بۆ ڕۆژهەڵات بۆ شەڕکردن لەگەڵ صەلاحەددینو توانی بەهۆی صەلاحەددینەوە (هەروەکو ڕۆژئاواییەکان خۆیان دەڵێن) ناوو ناوبانگ دەربکات، ئەم سەرکردەیە لە کوشتارێکی بەکۆمەڵدا نزیکەی (٣) هەزار مسڵمانی دیلی کوشت کە لە شاری (عەککا) گرتبوونی.

بەربڵاوبکاتە سەر شاری قودسو بێت داگیری بکات، صەلاحەددین کەوتە بەردەم هەڵوێستەکردنو بیریکردەوە چی بکات باشە؟ هەستا دەستیکرد بە سەردانیکردنی شورەی چوار دەوری قودسو یەك بەیەك هەموو شوێنەکانو گشت قەلاکانی پشکنی، تاوەکو بزانێت لە توانای سوپاو سەربازو شوێنە گرنگەکانیدا هەیە، تا بتوانین ڕووبەڕووی هێزی خاچ دروشمەکان بێتەوە، ئەمسەرو ئەوسەر گەڕاو بەبیری خۆی تێڕاماو سەرنجی لە شورەو توانا سەربازییەکانی سوپاکەیدا بۆی دەرکەوت ناتوانێت ڕووبەڕووی سوپای دوژمنەکەی بووەستێ، زۆر بێتاقەتو بە خەم بوو، پاشان هاتەوە ڕاوێژی بە دەوروبەرەکەی خۆیکرد، گوتی: باشە ئێمە چ بکەین هەر قودسمان هەیەو ئەویش لوتکەی سەرکەوتنمانە، ئەگەر خاچییەکان دەستی بەسەردا بگرن ئەوەشمان نامێنێت بڵێین قودسمان ڕزگارکردووە، لێرەدا بیری لەوە کردەوە کە لەخوا بپاڕێتەوە تاوەکو سەرکەوتنو پارێزگاری پێ ببەخشێت، ڕۆیشت دەستیکرد بەنوێژکردنو پاڕانەوە، نوێژیکرد، نوێژیکرد هەڵنەسایەوە، چووە سوجدە بردن، هەردەچوون بۆ لایو سەیریان دەکرد تەماشا دەکەن صەلاحەددین لە سوجدە بردن بۆ خوا هەڵناسێتەوە، جا (ابن شداد) دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئالەم کاتەدا ڕیچارد شێردڵ شارەزای قودس بە تەواوی نابێت، بەوانەی لە دەورووبەریدان دەڵێت: من شارەزای قودس نیم، دەتوانن نەخشەیەك بهێنن ناو قودسم پیشان بدات، تا بزانین ئەگەر هێرشی بۆ بەرین سەرکەوتوو دەبین یان نا؟ ئەوانیش کە شارەزان نەخشە دەهێننو یەك بەیەك شوێنەکانی قودسو دەوروبەری پیشاندەدەن دەڵێن ئەمە فلان دەرگایە هەر یەکەو بەناوێکەوە، ئەوە فلانە قەلاو شورەیە، ڕیچارد دەیهێنێتو دەیباتو بیر دەکاتەوە دەڵێت: ئێمە چاری سوپای صەلاحەددین ناکەین؟ لەبەر ئەوە لەو هێرشە کە بیکەینە سەر شاری قودس تێك دەشکێین، چونکە شارێکی وا، صەلاحەددین سەرکردەی بێو بەرگری لێبکات، ناتوانین سەر بکەوین، ئیتر بڕیار دەدات سوپاکەی بکێشێتە دواوەو دەگەڕێتەوە، کاتێ پیاوەکانی موخابەراتی صەلاحەددین ئەوانەی کە لە نزیك خاچییەکاندان بەمە دەزانن ڕاستەوخۆ نامەیەك دەنووسن بۆ صەلاحەددینو دەڵێن بێخەمو نارەحەت مەبە ئەوا ڕیچارد شێردڵ فەشەلی هێنا، تەماشای نەخشەکەی کردو بڕیاریدا بەکشانەوە، ئیتر هێرش ناکاتە سەر قودس، بە کۆترێکی نامەبەردا ئەم نامەیان نارد، کاتێ کرترەکە نامەکەی بردو نیشتەوە سەیری ژێر باڵیانکرد دەبینن نامەیەکی تێدایەو کردیانەوە ئەم هەواڵە خۆشەیان بیست، صەلاحەددینیش هەر لە نوێژدا بوو، چوون بۆ لای وتیان ئەی سوڵتان صەلاحەددین نارەحەت مەبە ئەوەتا ریچارد شێردڵ کشاوەتەوەو دەڵێ ناتوانین سەرکەوتن بەدەست بێنین لەداگیرکردنی قودسدا، سەرنج بدە ئەو کاتە صەلاحەددین ئەوەندە گریابوو ئەوبەرماڵەی کە نوێژی لەسەر کردبوو هەمووی بەجارێك خووسابوو لە فرمێسکی چاوەکانیدا، وەك مێژوونووسەکەی خۆی باسی لێوە دەکات، پاشان هەستاو دوڕکات نوێژی تریکردو سوپاسی خوای کرد کە دوعاکەی قەبوڵ بووەو وتی: سوپاس بۆ تۆ خوایە قودس لە دەستمان دەرنەچوو.

هەروەك باسم کرد لە بەغدابووم ڕۆژێك دەرسی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویم دەوتەوە لە هۆڵی خوێندندا لە بەشی مێژوو، ئەم ڕووداوەم گێڕایەوە بۆ قوتابییەکان، قوتابییەك هەستا وتی: مامۆستا بۆچی صەلاحەددین ئەمە بۆ قودس دەکات لەکاتێکدا وڵاتی خۆی نییەو خاكو نیشتمانی ئەو لەشوێنێکی ترە، منیش پێم وت: ئەوەی تۆ بیری لێدەکەیتەوەو لەمێشکتدایە ئەوکاتە صەلاحەددین بیری لەو شتانە نەدەکردەوە، ئەگەروەکو تۆ بووایە خۆی کە کوردێك بوو نەیدەتوانی ئەو هەموو کوردەی تر بباتو بچێت پارێزگاری لە خاکی ئیسلامو مسوڵمانان بکات، بیرکردنەوەی ئەو کاتە وەکو ئێستا نەبوو شەڕ شەڕی ئایینی بوو، نەك قەومیو جیاجیایی نەتەویی، بەڵکو صەلاحەددین بەخاکی خۆی زانیوە، بۆیە چووە لەوێ بەرگری لە خاکی ئیسلام بکات، ئەم قوتابییە فەشەلی هێنا، پاشان قوتابییەکی تر هەستا وتی مامۆستا هەرکەس بگری لەو شوێنانەدات مانای ئەوەیە لاوازە؟ وتم: بەڵێ، جا ڕاستەوخۆ ئەوەم وەبیر هاتەوە شەوی پێشتر کاتێ شاری (خورەمشەهر)[١] کەوتە

[١] خوڕەمشەهر: عەرەبەکان پێی دەڵێن موحەممەرە، سوپای عێراق لە ١٩٨٠/٨/٢٢ ئەم شارە ئێرانییەیان داگیر کرد، بەلام لە نیسانی ١٩٨٢ لەلایەن ئێرانەوە جارێکی تر ئەو شارە ئازاد کرایەوە، ئەوەبوو سوپای عێراق زۆر بەخراپی تێك شکانو زۆربەی سەربازەکانیان کوژرانو لە ئاوی

دەستی ئێرانییەکان صەددام حوسێن گریاو بێتاقەت بوو، کچەکەش وتی: مامۆستا ئەو گریانەی سەرۆك سەددامیش بەو شێوەیە بوو بەڵگەی بێهێزی سەرۆك سەددامە؟ منیش وتم: وەڵام لای خۆتە، (بێگومان بەڵێ لە لاوازیدا سەدام گریا) بەڵام کچەکە دەیویست واجبی خۆی بەجێبێنێ‌و راپۆرتێکم لەسەر بنووسێت، جا عەرەب دەڵێ: "الشئ بشیءو یڎکر" منیش بۆ موناسەبە ئەم چیرۆکەم گێڕایەوە.

**+ زۆر لە رۆشنبیرەتازەکانی کورد رەخنەی توند لە صەلاحەددین دەگرن کە گوایە هەستی نەتەوایەتی لاوازبووەو وەکو کوردێك بیری لەوە نەکردووەتەوە لەوکاتەدا دەوڵەتێکی کوردی دروست بکات، پێتوانییە ئەمە لەبێئاگایی ئەوانەوە بێت لەمێژووی ئەوکاتەی سەرکردە صەلاحەددین لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی ئێستادا، یاخود ئەوە زیاتر نەزعەیەکی قەومی توند رەوانەیە؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: مەسەلەی هەستی نەتەوایەتی چۆن نەبووە ئەوکاتە! ئەگەر صەلاحەددین هەستی نەتەوایەتی نەبووایە نەدەچوو کاروباری زۆربەی سوپاکەی بداتە دەست کوردەکان‌و هەموو شوێنەگرنگەکانیان بپێ بدات، باشە صەلاحەددین دەبێت چی بکردایە، دەوڵەتێکی کوردی دابمەزراندایە؟ دەبوو ئەو کاتە مێرنشینێکی بچوکی دابمەزرێنێت، یانی ئێمە دەبێت مەنتیقیانە قسە بکەین بەر لە صەلاحەددین میرنشینی کوردی هەبوو، دوای صەلاحەددینیش هەر میرنشین هەبوو، ئەگەر صەلاحەددینیش میرنشینێکی دروستبکردایە ئێستا هەروەکو ئەوانە باس دەکرا دەوترا (صەلاحەددین دامەزرێنەری ئیمارەی میرنشینی ئەیوبوویە.. یا میرنشینێکی بەناوێکە کە..). ئەو هات دەوڵەتی ئەیوبی دامەزراند لە میسر کەپێی دەوترا (ام الدنیا)، لە شام، لە بەشێك لە لیبیا، لەیەمەن، لە سودان، لە بەشێك لە کوردستان دیاربەکرو ماردین‌و موصڵ‌و هەولێرو شارەزوورو.. هتد.

ئەو کەسانەی رەخنە لە صەلاحەددین دەگرن دیارە زۆر بێئاگان، باشە بۆچی رەخنە لەوانەی پێش‌و دوای صەلاحەددین ناگرن ئەگەر راست دەکەن، ئیلا هەر دەبێت ملی صەهلاحەددین بگرن، بۆ بەکەسی تر ناڵێن، بۆ لەکوردەکانی ئێستا ناپرسن؟ بۆ لەدوو حزبە زەبەلاحەکە ناپرسن، بڵێن ئێوە بۆچی دەوڵەتێکی کوردی دروست ناکەن؟ من لەزۆر شوێنی تر وتوومە کاکە صەلاحەددین ئەگەر بۆ کورد ئیشی بکردایە، بۆ دەچێتە میسر، بۆ دەچێتە شام، بۆ دەچێتە شوێنەکانی تری دنیا؟ ئەسڵەن ئەگەر میرنشینی کوردیشی دابمەزراندایە ئەوا هەربەدەستی کوردەکان دەروخێنرا، چونکە ئەوکاتە هەموو ئەو میرنشینانەی کە هەبوو لە ململانێی‌و ناکۆکیدا بوون، هەریەکەو لە پێناوی فراوانکردنی سنووری قەڵەمرەوی خۆیدا هەوڵیدەدا دەسەڵاتیی زیاتری هەبێت، ئێمە هەموو میرنشینە کۆنەکان هەر لە (مەروانی، حەسنەوی، عەننازی) تاوەکو میرنشینە تازەکانی سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی (بابان، سۆران، بۆتان، بادینان.. تاد) تەنها خۆمان دەیانناسین بەشێوەیەکی گشتی ناویان نەچووەتە مێژووی جیهانەوە، بەڵام صەلاحەددین هەموو دنیا دەڵێ میللەتی (Saladin kurdish) میللەتی صەلاحەددینی کورد ئەمەیان گرنگترە.



لەبەر ئەوەش ئەو کوردانە یەخەی صەلاحەددین دەگرن، چونکە سەرکردەیەکی مەزن‌و گەورەی دنیای ئیسلامیی بوو، هەموو سەرکردەکانی پێش صەلاحەددین (٨٨) ساڵ بەر لە ئەویش نەیانتوانی قودس بگێڕنەوە بۆ ناو جیهانی ئیسلامیی‌و نەخشەی ئیسلامیی، پشتی خاچ دروشمەکانیان لە قەراخی دەریای ناوەڕست شکاند، لە میسر دەری کردن، هەروەها گۆڕی

گاڕۆندا خنکان، دواتر سەددام بەرپرسی ئەو ناوچەیە کە ناوی لیوا جەواد ئەسعەد شیفە بوو کوردی هەولێر بوو پێیوت: تۆ خیانەتت کردووە ئەوەبوو لەسێدارەیدا، خۆیشی لە بەرامبەر کامێرا تەلەفزیۆنەکەیدا دەگری.

پێغەمبەری ﷺ لەوە ڕزگارکردکە سەرکردەیەکی بێ قییەمی خاچییەکان ویستی دەری بێنێت بەناوی (ڕینۆدی شانیۆ)[1] بە فەرەنسییەکەی، بەلاّم عەرەبەکان پێی دەلێن (أرناط)[2].

لێرەدا ئەوە دەلێم بەو کوردانەی ڕەخنە لە صەلاحەددین دەگرن با کارێك نەکەن وەکو عەرەبە قەومییەکانی سەردەمی جەمال عەبدولناسر پەشیمان ببنەوە، چونکە ئەوانیش تاوەکو عەبدولناسر مابوو لە ڕوانگەی ڕەگەزپەرستانەی خۆیانەوە خوێندنەوەی نەشیاوو نابەجێیان هەبوو بۆ مێژووی سەرکردە صەلاحەددین، بەلاّم لەدوای ئەوەی عەبدولناسر مردو لەژێر کاریگەری دەمارگیری نەتەوەییانە دەرچوون هەموویان پاشگەزبوونەوە، دلنیام ئەگەر کوردەکانیش شارەزای مێژووی سەردەمی صەلاحەددین ببن ئەوا زوو پەشیمان دەبنەوە، چونکە هەموو ئەو ڕەخنەو قسانەی ڕووبەڕووی صەلاحەددینی دەکەنەوە لە نەشارەزاییدایە نەك ئاگابوون‌و خوێندنەوەی مێژووی ژیانی ئەو سەرکردەیە.

دەزانم ئەو کوردانەی قسە بە صەلاحەددین دەلێن ئەوە فەشەلیان هێناوە لەوەی کە ناوی سەرکردەیەکی تر بدۆزنەوە لەمێژوودا وەکو صەلاحەددین بێت، ئەمە جگە لە نەزعەیەکی قەومی هیچی تر نییە، ئەگەر ڕاست دەکەن با خۆیان بچن دەولەتێکی کوردی دروست بکەن‌و یەك دەست بن، بۆچی دادگایی صەلاحەددینێك دەکەن کە چەندین سالّە مردووەو لەژیاندا نەماوە، ئەمە جگە لەدۆڕاوی‌و دواکەوتوویی هیچی تر نییە، پێویستە ئێمە خۆمان بە بەرپرسیار بزانین نەك کەسێك کە هەشت سەد سالّە مردووە پێی بلێین تۆ چیت بۆ کورد کردووە؟ ئەم قسانە تێنەگەیشتنە لەڕۆحی سەردەمولە نەشارەزایی لە مێژوو.

بەوانەی ڕەخنە لە صەلاحەددین دەگرن دەلێم با مێژووەکەی بخوێننەوە نەچنە ژێر کاریگەری بیرو بۆچوونی ئەم سەردەمە، پێویستە موناقەشەی هەر بابەتێك لەو جۆرە دەکەن بزانن لە ڕۆحییەت‌و عەقلیەتی ئەو سەردەمەو بەپێوەری خۆی مامەلەی لەگەلّدا بکەن، ئەوەش بلێم زۆرێك لە سەرکردە کوردەکان کە زۆربەگیانی نەتەوەیی‌و ڕەگەزپەرستانەوەوە بیر ناکەنەوە ئەوە دەلێن کە ئەگەر بێت بەرگری لە جیهانی ئیسلامیی بکەین، ئەوا بەرگری لە خۆمان دەکەین، مەبەستم ئەوانەیانە کە لەژێر کاریگەری ئاییندا و بیر دەکەنەوە کە هاتنەوەی خاچییەکان بۆ شەڕی ئایین‌و دژایەتی ئیسلامە لە ڕۆژهەلاّتدا، کەواتە ئەمانە یان وەکو سەردەمەکەی صەلاحەددین‌و وەکو ئەو سەرکردەیە بیردەکەنەوە، بەلاّم قەومییەکان جنێوی پێدەدەن‌و تانەو تەشەری لێدەدەن، لێرەدا ئەوە دەردەکەوێت کە ئەو فکرەیەی صەلاحەددین هەیبوو هەلّە نەبووەوەتا ئێستاش ئەو فیکرەیە هەر ماوەو هەندێك کەس وا بیر دەکەنەوە.

ئێمە سەیری ئەم سالانەی دوایش بکەین تەنانەت کەسێك وەکو مەلیك مەحمود نەیتوانی دەولّەتێکی فراوان لە کوردستاندا دورست بکات، شێخ سەعید بە هەمان شێوە، قازی موحەممەدیش هەرفەشەلی هێنان لەبەرچی؟ لە بەر ئەوەی سەرکردەیەکی کاریزمی‌و بە بیروباوڕێکی پتەوەوە لەگەلّ ئەوەش دروست نەبوو.



---

[1] ئەم کابرایە زۆر بێزخ‌و سوك بوو کاتی خۆی لەسەردەمی نورەدین مەحموددا ماوەی پازدە سال حوکمدرابوو، بەلاّم کاتێ نوردەین مرد دەستو پێوەندەکانی ناکۆکییان تێکەوتو بەپارە مساوەمەیان کردو ئازادیان کرد.

[2] (أرناط) سەرکردەی شاری (کرك) بوو لە خوارووی ئوردون، هەر ئەمیش بوو کاتی خۆی بووە هۆی شکستی خاچییەکان لەبەرامبەر صەلاحەددیندا، کە صەلاحەددین توانی قودس ئازاد بکات، پاش سەرکەوتنە بەناو بانگەکەی جەنگی (حطین)، ئەم هات سوپای وشکانی‌و ئاوی ئامادەکرد بۆ ئەوەی بچێت بۆ مەککەو مەدینە لەوێ گۆڕی پێغەمبەر ﷺ دەربێنێ‌و بیبات بۆ (کرك) تاوەکو مسولّمانان ڕووبکەنە ئەوی‌و لەوێ زیارەت بکەن بۆ ئەوەی پارەیان لێ بسێنێت، بەلاّم بۆ ئەوە نەبوو دەیویست ئیهانە بەگۆڕی پێغەمبەر ﷺ بکات، بۆ ئەوەی بە موسلّمانەکان بلێت، ئەوەتا گۆڕی پێغەمبەرەکەتانم چی لێکردا!، ئەوەبوو سوپایەکی کەشتیوانی لە دەریای سوورەوە گواستەوە بۆ مینایەك لە نزیك مەککەو خەریکبوو بەهێرشێکی وشکانی بگاتە مەدینە، بەلاّم صەلاحەددین نەیهێشتو سوێندی خوارد وتی: دەبێ تۆلّەت لێ بکەمەوە، ڕاستی کرد قسەکەی خۆی بردە سەرو لە جەنگی حتین–دا بەدیل گرتی‌و وتی پەشیمان نیت لەو کارەی کردت، وتی نەخێر، صەلاحەددین ڕاستەو خۆ شیرێکی لێداو کوشتی.

**+ وەکو کەسێکی شارەزا لە ژیانی صەلاحەددین هیچ هەوڵێکت نەخستۆتە کار، یاخود پێشنیارت نەکردووە بۆ بەستنی کۆنفرانسێك دەربارەی (صەلاحەددین ناسی)، بۆ ئەوەی ئەو هەڵە تێگەیشتنە کە بەرامبەر بەم سەرکردەیە هەیە لەڕووی مێژووییەوە ساغ بکرێتەوە بۆ هەموولایەك؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: صەلاحەددین لە هەموو دنیادا کۆنگرەی لەسەر کراوە، من خۆم لە کۆنگرەکەی لە (دیاربەکرو ئەستەمبوڵ) لە (مؤسسة استنبول للدراسات التأريخية) بەشداریم کرد کە زیاتر لە (٥٠) وڵات بەشدار بوون تێیدا، دواتر سیمینارێکم بەست لە شاری (ئزمیر)، دواتر چووم لیبیاش هەروەکو هەمان کۆنگرە بەشداریم کردن ئینجا دەوڵەتی (ئیسرائیل) کە جولەکەیەو مسوڵمان نییە، کە عەرەب نییە، لە ساڵی ١٩٨٧ کۆنگرەیەکی لەسەر صەلاحەددین کرد وتی: لەبەر ئەوەی شەڕی (حطین) لەسەر خاکی ئێمە کراوە لەسەر دەریای بچووکی (تەبەریە) لە فەلەستین، جا ئەمە هەڵوێستی غەیرە مسوڵمانو غەیرە کورد، لە عێراقیش کۆنگرە کرا بەڵام ئەوەندەی بیروڕای ڕاگەیاندن (پڕوپاگەندەی سەددامی) زاڵبوو بەسەریدا، ئەوەندە باسی گرنگی صەلاحەددین نەبوو، هاتن لەتکریت بەناوی (مدينة البطلين) کۆنگرەیان لەسەر بەست و بە چەند سەعاتێك تەواویانکردو هیچ پسپۆڕێك بەشداریی نەکردبوو.

**با ئێمەش مامۆستاو پسپۆڕی زۆرمان هەیە لە زانکۆکانو لە دەرەوەی زانکۆکان، هەستین کۆنگرەیەکی گەورە بۆ ناسینی ئەو سەرکردە گەورەی کوردییە ببەستین کە هەموو دنیا باسی دەکات، ڕۆژئاوا پێمان دەڵێت: نەوە یا بنەماڵەی صەلاحەددین (أحفاد صلاح الدين)، بەڵام ئێمە خۆمان قەدری نازانینو و باسی ناکەین، خەڵك کۆنگرەی لەسەردەکات، ئێمە ناتوانین وەکو ئەوان بایەخی پێبدەین، تەنانەت وردە وردە ئەو شوێنە گشتیو دیارانەش کە ناوی صەلاحەددینیان لەسەر بووە خەریکە نایانهێڵێنو لەملاو لاوە لادەبرێن، تەنانەت من نامیلکەکە لە سلێمانی چاپ کرد ئەوەبوو دوایان خست، دیاربوو لەوە ترسابوون ئەم کابرایە چۆن باسی صەلاحەددینی کردووە، دواتر کە تێیان گەیاندبوون ئەم کابرایە بەڵگەی لایەو کەسێکی ئەکادیمییە ئینجا زۆر بەسەقەتی چاپیان کردبوون، خۆزگە چاپ نەکرایە کەی ئەوە شایستەی صەلاحەددین ـە ناتوانرێت بە باشی بخوێنرێتەوە، ئەویش وەرگێڕانی نامیلکەکەمە، بە عەربیم نووسیبوو، لە ژێر ناوی "ننناشد صلاح الدين ام نحاسب أنفسها، استجواب قائد بعد ثمانمائة سنة" لە دەزگای (ئاراس) لە هەولێری پایتەخت ساڵی (٢٠٠٢) ئەنجامدانی بەڕێز بەدران ئەحمەد حەبیب، زۆر بە جوانی لە چاپ دراوە. وەرگێڕاوە بەناونیشانی "صەلاحەددین بدوێنین یان خۆمان بە بەرپرسیار بزانین" لێپرسینەوەی سەرکردەیەك دوای هەشت سەد ساڵ، وەرگێڕانی ئاوازا جاف، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٥.**

من پێشنیار دەکەم بۆ بەستنی کۆنگرەیەك لەسەر صەلاحەددین، بۆ ئەوەی ئەو شتانەی نەزانراوەو ناڕۆشنەو دیار نییە بەدەنگێکی بەرز وەکو شارەزایان ئاشکرای بکەینو بۆ هەموو لایەکی ڕوون بکەینەوە کە ئەو سەرکردەیە وەکو کەسێکی حەقیقی چۆن بوو، ئێمە لە نەوەی صەلاحەددین ـین، باشە کۆنگرە بۆ صەلاحەددین نەبەسترێ ئەی بۆ کێ دەبەسترێ؟ با بۆ هەموو سەرکردەکانی تری مێژوومان بکریو بۆ ئەو سەرکردەیەش بکرێت، ئێمە ئەگەر شتێکی وا بکرێ دەتوانین لە دەرەوەو وڵاتە عەرەبییەکان کۆمەڵێك خەڵکی پسپۆڕی باگهێشت بکەین کە شارەزاییەکی تەواویان لەژیانی صەلاحەددین هەیەو کۆمەڵێك حەقیقەتی زیاتریشمان دەست دەکەوێت، من ئامادەم بە هەموو توانایەکی خۆم هاوکاری بگرمە ئەستۆ تاوەکو ئەو کارە بکەین، جا ئەگەر مەسئولەکان پێیان کراو کاتیان هەبوو ئەم نووسینەی جەنابت بخوێننەوە، ئەم داوایەی منیان گوێیان لێ بێتو ببینن ئینجا پێشنیارەکەم قەبوڵ بکەن.

**+ پێتوایە مێژوونووسانی عەرەبو ڕۆژئاوا پاشان ڕۆژهەڵاتناسەکان بەتەواوی مێژووی صەلاحەددینیان تۆمار کردبێت، یاخود هەرلایەکیان لە ڕوانگەی خۆیانەوە قسەیان لەسەر کردووە؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: ڕۆژئاواییەکان لێکۆڵینەوەی وایان لەسەر صەلاحەددین کردووە هەرگیز ئێمە پێمان ناکرێت، هەریەك لە کتێبەکانی (تأريخ الحجاج فيما وراء البحار)، لە پێش هەموویان (وليم الصوري) لە پاشان (ستيڤن رنسيمان، ستانلی لين بول، أرنست بيكر، (تأريخ الحروب الصليبية)، ستيڤن سن، ميخائيل السرياني، متا الرهاوي)، ئەمانە ڕۆژئاوایی‌و مەسیحین، بەڵام کتێبەکانیان ببینە بزانە بە چ شانازییەکەوە باس لە صەلاحەددین دەکەن، بە چ ڕێز لێنانێکەوە ناوی دەهێنن، دەبینی عەرەبەکانیش کە بزووتنەوەی نەتەوایەتی تێیپاندا دەرکەوت بەو سەرکردە مەزنە کوردییە دەڵێن (قائد عربي مسلم) پێیان شەرم بوو میسرو فەلەستین‌و سەرجەم شوێنەکانی تر بەدەستی سەرکردەیەکی کوردی مسوڵمان کە عەرەب نەبێت ڕزگار بکرێت، دەیانگوت ئەوە کورد نییە، ئەوە عەرەبە ئەوەندە ئازایە و چاو نەترسە بەرامبەر بە دوژمنان دنیا ڕزگار دەکات لێیان، عەرەبەکانی عێراق هەمیشە بۆچوونیان وابوو ئەگەر کورد بێدەنگ بووایەو داوای مافی خۆی نەکردایە ئەوا دەیانوت صەلاحەددین کوردە، بەڵام ئەگەر کورد لە شۆڕشدا بووبێتو پێیدا، گیری لە سەرمافەکانی خۆی بکردایە، یاخود بیوتایە ئێمەش نەتەوەیەکین‌و پێویستمان بە دەوڵەت یا حکومەتی خۆمان هەیە، ئەوا دەیانگوت صەلاحەددین عەرەبە، کەی کورد بووە! جا لێرەدا ئەوەم بیر دەکەوێتەوە شاعیرێکی فەلەستینی (معين بسيسون) شیعرێکی جوانی هەیە لەسەر صەلاحەددین دەڵێ: (صەلاحەددین مادام سەرکەوتووە ئەوا بوو بە عەرەب)، بەڵام ئەگەر سەرنەکەوتایە، ئەوا خائین‌و جاسوس دەبوو. شیعرەکە بە عەرەبی دەڵێت:

صلاح الدين صار عربيا حين انتصر

فلو كان هزم لصار جاسوسا كرديا

گەرچی کوردەکان قەت جاسوسیان نەکردووە، بەڵکو پاڵەوانەکانی سەردەمەکە بوون. کەچی خاوەنی خاکەکە نەبوون لە چەمکی نەتەوایەتی ەم سەردەمە، بەڵام عەرەبە کۆچەرییەکانی نیمچە دورگەی سینا لە میسرو عەرەبە کۆچەرییەکانی باشووری شام جاسووسییان دەکرد لەبەرژەوەندی خاچ دروشمەکانن بەتایبەتی ڕیچارد شێردڵی سەرکردەکەیان لە سەردەمی صەلاجەددیندا.

لەبەر ئەوە مێژوونووسەکان دەکرێن بەدوو بەشەوە ئەوانەی کە ناوی صەلاحەددینیان هێناوە بەشی یەکەم: ڕۆژئاواییەکانن، زۆریان بە (kurdsh leader) ناوی دەهێنن‌و نرخی صەلاحەددینیان زۆر بەجوانی لەلایە، دەڵێن بەڕاستی ئەوە سەرکردە بوو توانی وەکو سەرکردەیەکی کوردی ئیسلام سەرکەوتنی گەورە بەدەست بهێنێ بەسەر ڕۆژئاواییەکاندا.

بەشی دووەمیان نووسەرو مێژوو نووسە عەرەبی‌و ڕۆژهەڵاتییەکانن، ئەمانە زۆربەیان صەلاحەددین بە سەرکردەیەکی عەرەبی یان تورك! ! ناوی دەهێنن، ئەوانیش زیاتر عەرەب‌و تورکە نەتەوەییەکانن‌و ئەوانەی سەردەمی بیری نەتەوەپەرستی نوێن کە چاویان بەوە هەڵنایەت کە سەرکردەیەکی ناوداری ئیسلام کورد بێت‌و لە مێژوودا بەو شێوەیە ناو دەربکات. (بڕوانە صەلاحەددین بدوێنین یان خۆمان بە بەرپرسیار بزانین).




**+ لە پاش صەلاحەددین کەس توانی جێگای بگرێتەوە؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: صەلاحەددین لە جێگای خۆی کوڕەکەی دانا کە ناوی (عمادالدين عوسمان) بوو، هەروەها مەلیك عادل (سيف الدين ابوبكر)ی برای کرد بە ڕاوێژکاری کوڕەکەی خۆی تاوەکو ببێتە ڕێ نیشاندەرو ڕێنماییکەری، چونکە ئەو کوڕەی هیچی نەدەزانی‌و شارەزایی کەمبوو، لەبەر ئەوە نەیتوانی دەوری سەرەکی ببینێت.

**+ دواپرسیار، سەرەنجامی ئەیوبییەکان بەکوێ گەیشت، ئایا توانییان بەردەوامی بە دەوڵەتەکەیان بدەن؟**

دکتۆر موحسین موحەممەد: لەڕاستیدا ئەیوبییەکان هەر لە سەردەمی عیمادەدین زەنگی‌و نورەدین مەحمودەوە ناوو ناوبانگیان هەبوو، هەر بۆیە بەهێزی پێگەی سیاسیی ئەیوبییەکان هەر لە باوکی صەلاحەددین‌و شێرکۆی مامیەوە بۆیان

مابوویەوە، لێرەدا ناتوانین بڵێین ئەو ناوبانگەی ئەیوبییەکان بە پلەی یەکەم صەلاحەددین هێنایە کایەوە، بەڵکو پێشینەی هەبوو کە باپیری بوو، هەروەها سوپایەکی بەهێزو تۆکمەی دروستکردبوو کە هەموویان لایەنگری خۆی بوون لە میسردا.

وەکو وتم کاتی کە مەلیك عادل ـی ڕاوێژکاریی لەگەڵ کوڕەکەی صەلاحەددین فەرمانڕەوایەتی دەولەتی ئەیوبییان بەڕێوە برد، بیستو پێنج ساڵ لە پاش صەلاحەددین مرد، ئیتر حوکم کەوتە دەست کوڕەکانی عادلو کوڕەکانی خودی صەلاحەددین.

وردە وردە ململانێو ناکۆکی کەوتە نێوان کوڕەکانی تا وای لێهات هەیبەتو قورسایی دەولەتی ئەیوبی کەم بوویەوە، جگە لە مەلیك (ظاهر شهاب الدين غازي) کە حاکمی حەڵەب بوو وە دەوریی باشی بینی، کوڕەکانی نەیانتوانی جێگای باوکیان بگرنەوە، ئەمە هۆکارێکی سەرەکی گرنگبوو بۆ لاوازبوونو ڕووخانی دەولەتی ئەیوبییەکان تاوەکو دواجار ڕووخاو مەمالیکەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست (١٢٥٠ز ـ ٦٤٨ك).



ژیاننامەی زانستیی دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن



ـ لە هەولێر ١٩٤١ لە دایکبووە، خونێدنی سەرەتایی و دواناوەندی هەر لە هەولێر لە ساڵی (١٩٥٨)دا تەواو کردووە.

ـ لە ساڵی ١٩٦٢دا بەشی مێژوو، کۆلێژی پەروەردە، زانکۆی بەغدای تەواو کردووە.

ـ پاش نۆ ساڵ لە خزمەتکردن لە بواری فێرکردندا، لە قۆناغی دواناوەندی، پەیوەندی بە خوێندنی باڵاوە کردووە، لە کۆلێژی ئاداب ـ زانکۆی بەغدا، توانیویەتی بڕوانامەی ماستەر بەدەست بێنێت لە بابەتی (أربيل في العهد الأتابكي)، ساڵی ١٩٧٤، دوای ئەوەش لە هەمان زانکۆو کۆلێژ دامەزراوە، بەڵام بەشی زمانی کوردیی.

ـ لە ساڵی ١٩٧٧دا هەر لە هەمان کۆلێژ پەیوەندی کردووە بە خوێندنی دکتۆراوە، توانیویەتی لە ساڵی ١٩٨١دا بڕوانامەی دکتۆراکەی لەسەر بابەتی (الجيش الأيوبي في عهد صلاح الدين، تكوينه، تركيبته، تنظيمه، اسلحته، بحريته، وأبرز معاركه) وەربگرێت.

ـ بۆ پلەی (ئوستازی یاریدەدەر) لە ساڵی ١٩٨٤دا بەرز بۆتەوە، لە ساڵی ١٩٩١یشدا گەیشتووەتە پلەی (ئۆستان).

ـ لە کۆلێژی ئاداب و پەروەردەی زانکۆی بەغدا لە بەشی کوردی لە نێوان ساڵانی (١٩٧٤ ـ ١٩٨٢) کاریکردووە، پاشان بۆتە سەرۆکی هەمان بەش (بەشی زمانی کوردیی)، دوای ئەوە گوازراوەتەوە بۆ بەشی مێژووی کۆلێژی پەروەردە لە نێوان ساڵانی (١٩٨٢ ـ ١٩٩٤).

ـ پەیوەندیی کردووە بە زانکۆی صەلاحەددینەوە لە ساڵی (١٩٩٤ ـ ١٩٩٦) ماوەتەوە، پاشان چۆتە دەرەوەی وڵات بۆ لیبیاو لە زانکۆی (مصراتە) لە ساڵانی (١٩٩٦ ـ ٢٠٠١) ماوەتەوە.

ـ بەشداریی لە چەندین کۆنگرەو سیمیناردا لە عێراق و هەرێمی کوردستان و دەرەوەشدا کردووە.

ـ نۆ دانراوی هەیە، کە لەبەغداو هەولێرو بەیروت و عەممان چاپکراون.

ـ چەندین توێژینەوەی بە زمانی کوردیی و عەرەبی لە گۆڤارەکانی: (کۆلێژی ئاداب، کۆڕی زانیاری عێراقی (دەستەی کوردیی)، لە گۆڤاری (العربية) تایبەت بە زانستە مرۆڤایەتییەکان، زانکۆی کوەیت، لە گۆڤاری (جامعة الرياض السعودية) هەروەها لە گۆڤارە کوردییەکانی وەکو (ڕۆشنبیری نوێ) و (سەنتەری برایەتی) هەولێر)دا، هەروەها لە چەند ڕۆژنامەیەکیش لە هەولێرو بەغدادو سلێمانی بابەت و توێژینەوەکانی ناوبراو بڵاوکراونەتەوە.

ـ وەکو بەرپرسی خوێندنی باڵاو سەرۆکی لیژنەی بەرزکردنەوەی پلەی زانستی مامۆستایان، کۆلێژی ئادابی زانکۆی صەلاحەددین کاریکردووە، هەروەها لە لیژنەی دانانی پرۆگرامی مێژوو لە وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمیشدا کاریکردووە.

ـ لە زانکۆی (سلێمانی، کۆیە و صەلاحەددین)یش وانەی بەفێرخوازانی خوێندنی باڵا وتۆتەوە.

ـ گرنگییەکی زۆری بە فەلسەفەی مێژوو، نووسینی مێژوویی، ڕۆژهەڵاتناسی، میتۆدی لێکۆڵینەوەی مێژوویی، گروپە ئیسلامییەکان، فیکری سیاسیی —داوە.

ئەو بەدەر لە پرۆفیسۆرییەتی خودی خۆی لە مێژووی ئیسلامیی هەولێرو مێژووی صەلاحەددینو شەڕی خاچ دروشمەکان، تەنها لەو بوارانەدا سێ کتێبی داناوە .

ـ لە بەغداو هەولێرو لیبیاو سلێمانیو کۆیە، سەرپەرشتیاری چەندین نامەی ماستەرو دکتۆرای کردووە، جگە لە موناقەشەی نامەی فێرخوازان لە زانکۆی دهۆکو زانکۆکانی دیکە، کە ئاماژەمان بۆیان کرد.

ـ ئێستاش لە زانکۆی صەلاحەددین لە هەولێر لەکارو خزمەت بەردەوامە .



## سەرچاوەکان


١ـ ابن خلكان، وفيات الأعيان، طبعة القاهرة، ١٩٤٨.

٢ـ ابن خلكان، شمس الدين أحمد بن محمد بن ابي بكر الأربلي (ت ٦٨١ﻫ ـ ١٣٨٢م).

٣ـ ابن واصل، مفرج الكروب في أخبار بني أيوب، مطبعة جامعة فؤاد الأول، القاهرة، ١٩٥٣.

٤ـ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، مطبعة دار الكتاب البناني، بيروت.

٥ـ التأريخ الباهر في الدولة الأتابكية با لموصل وحلب.

٦ـ المنتظم في تأريخ الملوك والأمم، طبعة دار الوطنية، بغداد، ١٩٩٠.

٧ـ المقدمة، ابن خلدون، طبعة مكتبة المدرسة ودار الكتب البنانى، للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٩.

٨ـ العراضة في الحكاية السلجوقية، ترجمة د. عبدالنعيم محمد حسنين و د. حسن أمين، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٧٩.

٩ـ أرنست باركر: الحروب الصليبية، ترجمة د. الباز العريني، مطبعة لجنة البيان العربي مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٦٠.

١٠ـ ادواركار، ماهو التأريخ؟

١١ـ د. أحمد محمود صبحي، في فلسفة التأريخ، مؤسسة الثقافية الجامعية، الأسكندرية، ١٩٧٥.

١٢ـ د, أحمد عبدالعزيز: الهذ بانيون في أذربيجان واربيل و الجزيرة، رسالة ماجستر غير منشورة، كلية الأداب، جامعة صلاح الدين، اربيل، ١٩٩٠.

١٣ـ د. اسماعيل شكر رسول: الأمارة الشدادية في بلاد ئاران، دار موكرياني للطباعة والنشر ـ اربيل ٢٠٠١.

١٤ـ دلير اسماعيل فرحان: الكرد في اليمن، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الأداب، جامعة صلاح الدين، أربيل، ٢٠٠٢.

١٥ـ د. فاروق عمر فوزي، د. محسن محمد حسين: الوسيط في تأريخ فلسطين في العصر الأسلامي، دار الشروق للنشر والتوزيع، عمان، الأردن، ١٩٩٩.

١٦ـ د. قاسم عبده قاسم: ماهية الحروب الصليبية؟ عالم المعرفة، الكويت، ١٩٩٠.

١٧ـ د. محسن محمد حسين: اربيل في العهد الأتابكي، مطبعة أسعد، بغداد، ١٩٧٦.

١٨ـ د. محمد صالح المنصور: أثر العامل الديني في توجيه الحروب الصليبية، منشورات جامعة قاريونس، بنغازي، ليبيا، ١٩٩٦.

١٩ـ د. نظير حسان سعداوي: التأريخ الحربي المصري في عهد صلاح الدين، مكتبة النهظة المصرية، القاهرة، ١٩٥٧.

٢٠ـ د. حسين مؤنس، نورالدين محمود، مطبعة مصر، ١٩٥٩.

٢١ـ د. نظير حسان سعداوي، المؤرخون المعاصرون لصلاح الدين، مطبعة لجنة البيان العربي، القاهرة، ١٩٦٢.

٢٢ـ د. سعيد عبد الفتاح عاشور: الحركة الصليبية، مكتبة الأنجلو المصرية، مطبعة لجنة البيان العربي، ١٩٦٣.

٢٣ـ وفيات الأعيان وأنباء أبناء الزمان، تحقيق د. احسان عباس، مطبعة الغريب، دار الثقافة، بيروت، ١٩٦٨ ـ ١٩٧١.

٢٤ـ ستيفن رنسيمان: تأريخ الحروب الصليبية، ترجمة د. الباز العريني، طبعة دار الثقافة، بيروت، ١٩٦٨.

٢٥ـ عمادالدين الكاتب الأصفهاني، محمد بن محمد بن حامد بن عبدالله (ت ٥٩٧ﻫ ـ ١٢٠١م).

٢٦ـ عبدالرقيب يوسف: الدولة الدوستكية في كردستان الوسطى، بغداد، ١٩٧٣.

٢٧ـ علي بيومي، قيام الدولة الأيوبية في مصر.

٢٨ـ مفرج الكروب في أخبار بنى أيوب، تحقيق د. جمال الدين الشيال، المطبعة الأميرية، القاهرة، ١٩٥٧.

٢٩ـ معجم البلدان، ياقوت الحموي، دار صادر ـ دار بيروت، لبنان ١٩٥٥ ـ ١٩٥٧.

## لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشك)

| زنجیره | ناوی کتێب | نووسه‌ر |
| --- | --- | --- |
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | فازڵ قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێنندامە)ی زەردەشتی | ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ،<br>ئەفسانەی مێژوونووسێك | حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئامادەکردنی:<br>ئارام عەلی سەعید |

